رێکخراوی لێکۆڵینەوەو گەشەپێدان

# ئالوودەبوون بەمادەی هۆشبەر

## لێکۆڵینەوەیەکی تیۆری و مەیدانی
## لەهەرێمی کوردستاندا

د. خانزاد ئەحمەد عەبد          ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

٢٠١٩ چاپی یەکەم

رێکخراوی لێکۆڵینەوەو گەشەپێدان

ناوی کتێب: ئالوودەبوون بەمادەی هۆشبەر، لێکۆڵینەوەیەکی تیۆری و مەیدانی
ناوی نووسەران: د. خانزاد ئەحمەد عەبد و ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
تایپ و هەڵەبڕی: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
نەخشەسازیو بەرگ:
چاپی یەکەم: ٢٠١٩
چاپخانە: ئازادی
تیراژ:

ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەکو بەشێك لە پرۆژەی ڕوو بەڕوو بوونەوەی بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر لەلایەن لێکۆڵەرانەوە، بۆ ڕێکخراوی لێکۆڵینەوەو گەشە پێدان ( RDO ) نووسراوە.

ئەم پرۆژەیە بە پاڵپشتی ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی ( PAO ) جێبەجێکراوە.

سوپاس بۆ تۆڕی داد پەروەری بۆ بەندییەکان لەعێراق، کە هاوکاری زۆریان کردین لە پڕکردنەوەی فۆرمەکان لەناو چاکسازییەکاندا، بەبێ هاوکاری ئەوان، لایەنی مەیدانی ئەم کارە ناتەواو دەبوو.

# پێرست

# پێشەکی

بڵاوبوونەوەی دیاردەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر ـ سڕکەر، دیاردەیەکی ناوخۆیی نییە، بەڵکو دیاردەو کێشەیەکی جیهانییە، بۆیە وڵاتان و دامـەزراوە نێـو دەوڵەتییـەکان پێکـەوە لەهەماهەنگیـدان بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی ئـەم دیاردەیـەو، دانـانی ڕێوشـوێنی پێویسـت بـەرێگا لێگـرتن لەتەشـەنەکردنی و، هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری لـەبارەی ئـەو مەترسـی و کێشـانەی لێیـان دەکەوێتەوە.

دیاردەی بڵاوبوونەوەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر، لەئێستادا بۆتە باسـی گــــەرمی هەواڵـــەکان و ڕیپۆرتـــاژە ڕۆژنامەوانییـــەکان و پرۆگرامـــە وتووێژئامێزەکان، بۆیە بۆتە بەشێك لەو باسـانەی بەگشـتی لـەنێو کۆمەڵگـەو خێزانی کوردستانیدا بڵاوبۆتەوە. ئالوودە بـوون بـەمادەی هۆشـبەر کارەسـاتی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و تەنـدروسـتی و ئـابووری گـەورەی لێ دەکەوێتـەوە، بۆیـە هەڵمەتـەکانی هێزەکـانی پـۆلیس و ئاسـایش لەهـەرێمی کوردسـتان بـۆ دەسگیرکردنی بازرگانان و ئالوودە بووان، بەشێکە لەم ڕێوشوێنانەی لەئێستادا گیراونەتەبەر بۆ ڕێگرتن لەتەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی زیاتر ئەم دیاردەیە تازەیـەی نێـو کۆمەڵگـەی کوردسـتانی کـە تـەنیا دە سـاڵێك پـێش ئێسـتا، بەناوچەیەك پاك و بێگەرد دادەنرا لەم بوارەدا.

بـەهۆی ئـەوەی تـا ئێسـتا هـەموو هەوڵـەکانی دەزگاکـانی پـۆلیس و ئاسـایش، سـەرکەوتوو نـەبوون لـەوەی ڕێگـری لەبڵاوبوونـەوەی ئـەم دیاردەیـە بکـەن، سەرکەوتوو نەبوون لەوەی ڕێگری لـەبازرگانیکردن بـەمادەی هۆشـبەر بکـەن،

چونکە ئەو باندانەی ئەم بازرگانییە ڕێکدەخەن و بەڕێوەی دەبەن، پارەی پێ پەیدا دەکەن و بازرگانی پێوە دەکەن، باندی گەورەو دەستڕۆیشتوو بن، نەوەکو تەنیا لەنێو هەرێمی کوردستاندا، بەڵکو لەسەر ئاستی هەرێمی و نێو دەوڵەتیشدا. بەپێی هەندێك ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان، بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر، لەدوای بازرگانیکردن بەچەك، بەپلەی دووەم دێت و پێش بازرگانیکردن و فرۆشتنی نەوتیش کەوتووە.

بێگومان لەئێستادا لەسەر ئاستی جیهان، وەکو کارەساتێکی کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری تەماشای ئەم دیاردەیە دەکرێت، بۆیە لەسەر ئاستی جیهانیدا، بەردەوام سیمینارو، کۆڕو، کۆبوونەوەو، کۆنگرەی نێو دەوڵەتی بۆ ساز دەکرێت، بەو سیفەتەی لەئێستادا بۆتە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی و، هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی نێو دەوڵەتی، بەتایبەتیش لەم دوو دەیەی دواییدا.

مەترسی بڵاوبوونەوەی دیاردەی مادەی هۆشبەر ئەوەندە گەورەیە، بەشێوەیەك لەئێستادا وەکو چەکێکی شاراوە لەململانێ ناوچەیی و نێو دەوڵەتییەکاندا پەنای بۆ دەبرێت و بەکار دەهێنرێت، بەتایبەتیش توێژی گەنجان دەکرێنە ئامانج، بۆ ئەوەی لەپەل و پۆ بخرێن و بکرێنە بار بەسەر کۆمەڵگەو دەوڵەتدا. بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە، کۆمەڵێك ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و یاسایی بەرهەم دێن، وەکو چۆن لێکەوتەی گەورەی لێ دەکەوێتەوەو دەبێتە هۆی زیاتر بوونی تاوان بەهەموو جۆرەکانی و، زیاتر بوونی شێوازەکانی سەرپێچیکردنی یاسایی، ئەوەش پێویستی بەکۆمەڵێك ڕێکاری یاسایی تازە هەیە، بۆ ئەوەی بەری لێبگیرێت.

ئالوودە بووان تەنیا مەترسی نین بۆ سەر کەسایەتی و بنەماڵەی خۆیان، بەڵکو دەبنە مەترسی بۆ سەر کۆی گشتی کۆمەڵگەش. بەهۆی ئەوەی هۆشی خۆیان لەدەست دەدەن و، دەکەونە نێو حاڵەتێکی سایکۆلۆژی ئاڵۆز، زۆرجار بێ ئەوەی مەبەستیشیان بێت، تاوان و پێشێلکاری و سەرپێچی ئەنجام دەدەن. ڕەنگە باشترین ڕێگا بۆ خۆپاراستن، بلاوکردنەوەی وشیاری بێت لەنێو کۆمەڵگە بەمەترسییەکانی ئالوودە بوون بەمادە هۆشبەرەکان، بەڵکو بتوانرێت لەم ڕێگایەوە داخوازی لەسەر بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر کەمتر بکرێتەوە، بەتایبەتیش لەنێو توێژی گەنجاندا. لەنێو هەموو وڵاتێکدا، توێژی گەنجان بزوێنەری وزەکانی کۆمەڵگەن، سامانێکی گرنگن دەبێت سەرمایەگوزاریان لەسەر بکرێت و پەرە بەهێزو وزەو تواناکانیان بدرێت و، ڕێگا نەدرێت بکەونە داوی بازرگانان و لەدەست دەربچن و ئاییندەیان بفەوتێت.

لێرەوە، گرنگە بایەخ بەئاستی ڕۆشنبیری و عەقڵی و فیکری گەنجان بدرێت، دەرفەتیان لەبەردەمدا بکرێتەوە بۆ ئەوەی بەشداری لەئاوەدانکردنەوەی وڵات بکەن و، ببنە خاوەنی کەسایەتی و توانای خۆیان. بۆیە ڕۆڵی خێزان و بنەماڵە لەوشیارکردنەوەدا، ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ و کاریگەرە.

ڕاپۆرتی ڕێپێدراوی ئەوروپی بۆ ساڵی (٢٠٠٩) ئاماژە بەبازاڕەکانی مادەی هۆشبەر دەکات و، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سەرەڕای هەوڵی زۆر بۆ ڕێگرتن لەبلاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە لەدە ساڵی پێشتردا، بەلام ئەنجامەکان جێگای دڵخۆشی نین. بەپێی ئەم ڕاپۆرتە، لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩٨ ــ ٢٠٠٧) دا، ڕەوشی وڵاتانی پێشکەتوو کەمێك باشتر بووە لەکۆنترۆڵکردنی

بازرگانیکردن و بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر، بەڵام ڕەوشی وڵاتە هەژارو دواکەوتووەکان، خراپتر بووە.

لەلایەك نرخی مادەی هۆشبەر دابەزیوەو بەنرخێکی هەرزانتر دەست دەکەوێت، هەروەها زۆریش بڵاوبۆتەوەو بازرگانی ناوچەیی و لۆکاڵیش تێوەی گلاونز لەلایەکی تریش ژمارەی ئالوودە بووان زیاتر بووە. بۆیە ئاسان نییە بتوانرێت ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی تاکلایەن چارەسەر بکرێت، بەڵکو پێویستی بەهەماهەنگی گشتی کۆمەڵگە هەیە.

یەکێك لەو خاڵانەی ئەم ڕاپۆرتە ئیشی لەسەر کردووە، بریتییە لەنەبوونی داتاو زانیاری پێویست لەنێو وڵاتاندا، یا ئەگەر ئەم داتاو زانیارییانەش هەبن، وڵاتان بڵاوی ناکەنەوە، بەوەش مەترسی ڕاستەقینەی بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر، بەشێوەی تەواوی خۆی دەرناکەوێت و، هەمیشە بەشێك لەڕاستییەکان دەشاردرێتەوەو پەردەپۆشە دەکرێت.

ئەم ڕاپۆرتە بۆمان ئاشکرا دەکات ئەو سیاسەت و ڕێکارانەی تا ئێستا لەسەر ئاستی وڵاتاندا گیراوەتەبەر، نەیتوانیوە ڕێگری لەبڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە بکات. بۆیە ئەنجامی ڕاپۆرتە نێو دەوڵەتییە دواترەکانیش، ئەوەمان پێدەڵێن کە تا ئێستا هەوڵێکی زۆر جدییانە نییە بۆ ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر، لەبەرئەوەی سەرچاوەی داهات و سامانێکی زۆرە بۆ زۆر کەسانی دەستڕۆیشتووی نێو وڵاتان کە ڕەنگە تێوەگلابن لەم بازرگانییە.

هەرێمی کوردستانیش وەکو ناوچەیەك کە بۆ ماوەیەکی زۆر، تەنیا هێڵی تێپەڕین و بازرگانیکردن بووە بەمادە هۆشبەرەکان، لەم چەند ساڵەی دواییدا، بۆتە بازاڕێکی تازەی گەرم بۆ ئالوودە بوون و بەکارهێنانن

بەشێوەیەك ڕۆژ نییە باندێك لەبازرگانان و ئالوودە بووان لەلایەن پۆلیس و ئاسایش دەسگیر نەکرێن، بێ ئەوەی ئەم دەسگیرکردنە بوو بێتە هۆی کەمتر کردنەوەی ئەم دیاردەیە. بەپێچەوانەوە، ئەم دیاردەیە لەنێو هەرێمی کوردستاندا ڕۆژانە لەتەشەنەسەندندایەو کوردستان بازاڕێکی تازەیە بۆ ئەم بازرگانییە قازانج بەخشەی کە تەنیا بازرگانانی مادە هۆشبەرەکان لێی سوودمەند دەبن و، کارەساتی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و تەندروستی و ئابووری بەدواوەیە.

# بەشی یەکەم

## گرنگی ئەم توێژینەوەیە

١) زۆربوونی ڕێژەی ئالوودە بووان بەمادەی هۆشبەر لەم چەند ساڵە کەمەی دواییدا، بەشێوەیەك بەشێکی زۆر لەوانەی بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە، جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە چەند مانگێکە، یا یەك دوو ساڵە، دووچاری ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر هاتوون.

٢) دەسگیرکردنی زۆر لەو گەنجانەی لەماوەی ئەو چەند مانگەدا ئالوودەی مادەی هۆشبەر بوون و، مامەڵەکردن لەگەڵیان وەکو تۆمەتبارو ڕاگرتنیان، ئینجا دادگاییکردن و زیندانیکردنیان. ئەوەش ئەگەر ڕێکارێکی یاساییش بێت، بەڵام کێشەی کۆمەڵایەتی و دەروونی زۆر بۆ ئەم گەنجانە دروست دەکات، بەتایبەتیش ئەگەر بزانین لەچاکسازییەکاندا، هێشتا سیستەمێکی پێشکەوتووی چارەسەری ئالوودە بوون نییە، بەرنامەو پرۆگرامی دەروونی بۆ سەرلەنوێ ئامادەکردنەوە ئالوودە بووان، یا نییە، یا ئەگەر هەبێت بەپێی سیستەمێکی نوێ بەڕێوە ناچێت و لەشێوە کلاسیکییەکەیدا ماوەتەوە.

٣) بایەخ و گرنگیدانی ئێمە وەکو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و چالاکوانانی مافەکانی مرۆڤ بەبلاوبوونەوەی ئەم دیاردەیەو، کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی بەسەر کۆی گشتی کۆمەلگەی کوردستانی. کۆمەلگەی مەدەنی بەهۆی ئەوەی هێزێکی نەرمی گۆڕانکارییەو دەتوانێت لەدەرەوەی سەمتی باوی ڕێکاری کارگێڕی دامەزراوە حکومییەکاندا ئیش بکات، دەتوانێت پێشڕەو بێت لەدەستنیشانکردنی کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەلگەو، هانی دامەزراوە حکومییەکان بدات کاریان لەسەر بکەن و سەرنجیان بۆ ئەم دیاردانە ڕابکێشن.

٤) گەشەکردنی خێرای بلاوبوونەوەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەرو، دروستکردنی مەترسی لەنێو چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەلگەو دڵەڕاوکێ لەوەی نەوەکو منداڵەکانیان دووچاری کێشەی ئالوودە بوون بێن. بەتایبەتیش ئەگەر بزانین لەم یەك دوو ساڵەی دواییدا، لەچەند قوتابخانەیەکی دوا ناوەندی کوڕان و کچاندا چەند دیاردەیەکی لەم شێوەیە بلاوبوونەوە.

٥) هەوڵدان بۆ خستنە ڕوو و پیشاندانی کاریگەری خراپی دیاردەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر لەسەر گەنجان و، ئەو کێشەو گیروگرفتانەی بۆیان دروست دەکات، کە ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی بەیەکجارەکی ئایندەی خۆیان وەکو هێزێکی کاراو چالاکی کۆمەلگە لەدەست بدەن و ببنە ئامرازێك بەدەستی باندەکانی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر.

٦) یەکەم توێژینەوەیە پشت بەفۆڕمی ڕاپرسی دەبەستێت کە لەلایەن ئالوودە بووانەوە پڕ کراوەتەوەو، خۆیان لەمیانەی وەڵامدانەوەی پرسیارەوە کێشەکانی خۆیان دەستنیشان دەکەن.

٧) دەکرێت ئەم توێژینەوەیە ببێتە دەروازەیەك بۆ دانانی پلانێکی ستراتیژی کورت مەودا ـ دوور مەودا، هەروەها ببێتە بنەمایەك بۆ دارشتنی یاسایەکی سەردەمیانە لەلایەن ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و پێشکەشی پەرلەمانی کوردستان بکرێت، بۆ ڕێگرتن و بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە.

٨) یارمەتی بەرپرسان و دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان دەدات بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی تازەو باشتریان هەبێت بۆ ئەم دیاردەیەو، شێوازە یاساییەکانی بەرەنگاربووونەوەی لەسەر هەموو ئاستەکاندا (بەکارهێنەران، بازرگانان).

٩) هەژاری کتێبخانەی کوردی لەتوێژینەوەی زانستی و ورد کە پشت بەداتاو زانیاری تازە ببەستێت، یەکێك بوو لەو هۆکارانەی پاڵی بەلێکۆڵەران ناوە ئەم لێکۆڵینەوە تیۆری و مەیدانییە بێننە ناو کارو پرۆژەی ڕێکخراوەیی و ئیشی لەسەر بکەن، بەهیوای ئەوەی لەمەوداو بایەخی زۆرتر بەلێکۆڵینەوەی تیۆری و مەیدانی بدرێت لەبواری ئالوودە بوون و، شێوازەکانی ئالوودە بوون و، جۆرەکانی مادەی هۆشبەرو، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی باشتر لەڕووی داتاو زانیارییەوە.

## کێشەکانی ئەم توێژینەوەیە

ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر دیاردەیەکی جیهانییەو لەئێستادا، زۆرینەی کۆمەڵگەکان بەدەستییەوە دەناڵێنن، بەجیاوازی ڕێژەی بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر لەنێو سنووری وڵاتاندا. بۆیە ڕادەی مەترسی بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیەو، ڕێکارەکانی بەرەنگاربوونەوەی، لەکۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی تر جیاوازەو لەگۆڕاندایە، چونکە هەر کۆمەڵگەیەك بەڕەچاوکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و دەروونی و لایەنی ڕێکارە یاساییەکانی خۆی، بەرەنگاری ئەم دیاردەیە دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەی هەوڵێکی زۆر هەیە بۆ یەکخستن و ڕێکخستنی هەوڵەکانی بەرەنگاربوونەوەو بەگژداچوونەوەی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر، چونکە لەئێستادا ئەم شێوە بازرگانییە، بۆتە بازرگانییەکی نێو دەوڵەتی و تۆڕێکی فراوان کاری تێدا دەکەن.
سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە لەو چەند ساڵەی دوایی لەهەرێمی کوردستان، کۆمەڵێك بارودۆخی کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و یاسایی و، تەنانەت سیاسیشی لێکەوتۆتەوە. لەبەرئەوەی ئەم دیاردەیە لەنێو کۆمەڵگەی کوردستانی نێو هەرێمی کوردستانی عێراق تازەیە، بۆیە جۆرێك لەنا ڕۆشنی و تێکەڵاوی و ئاڵۆزی هەیە، هەم لەشێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئالوودە بووان و، هەم لەمامەڵەکردن لەگەڵ بازرگانان، هەمیش لەسەر ئاستی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ناوەندی دەسەڵاتدارەکانی حکومەت و پەرلەماندا.

بۆیە بەرچاو ڕوونییەکی ئاشکرا لەئارادا نییە بۆ شێوازی بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر، ستراتیژییەتێکی نیشتیمانی داڕێژراوو ڕوون نییە، پلانێکی کاری فرە لایەن و فرە ڕەهەند لەئارادا نییە، یاسایەکی تایبەت نییە کە لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە دەرچوو بێت و لەسەر تێگەیشتنێکی لۆژیکی و واقیعییانە دامەزرا بێت، بتوانێت بەرسڤی ئەم دیاردە تازەیە بداتەوە.

وەکو چۆن لەسەر ئاستی لێکۆڵینەوەی تیۆری و مەیدانی بۆشاییەکی یەکجار گەورە هەیەو، کاری دەگمەن و کەسییانە نەبێت، ئیش لەسەر ئەم پرسە نەکراوە، بۆیە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە، هیچ داتایەکمان لەبەردەستدا نییە بتوانین لەسایەیەوە ڕێژەی گەشەکردنی ئەم دیاردەیە، یا ڕێگری لێکردن و کەم بوونەوەی دەستنیشان بکەین. بۆیە یەکێك لەکێشە گەورەکانی بەردەم ئەم لێکۆڵینەوەیە، نەبوونی داتاو زانیاری فەرمی مانگانە، یا شەش مانگی، یا ساڵانەی حکومەت بوو، تاوەکو بزانین ئێمە لەکوێین و دەمانەوێت بگەنە کوێ لەڕوو بەڕووبوونەوەی ئەم دیاردەیەدا.

لەسەر ئاستی یاسادانان کێشەیەکی گەورە هەیە، لەسەر ئاستی سیاسی و ئابووری جۆرێك لەتێنەگەیشتن لەمەترسییەکانی ئەم دیاردەیە هەیە، لەسەر ئاستی ئاسایش و پۆلیسیشدا، تەنیا هەندێك ڕێکاری زۆر کۆن دەگیرێتەبەر، کە خۆی لەگرتن و زینداینکردن و حوکمدانی بازرگانان و ئالوودە بووانـدا دەبینێتەوە، بەبێ ئەوەی ئالوودە بوو وەکو قوربانییەك تەماشا بکرێت و هەوڵی چارەسەری پزیشکی و دەروونی و کۆمەڵایەتی بۆ دابین بکرێت.

هیچ ڕێکارێکی ئاسان لەئارادا نییە بۆ چارەسەرکردنی ئالوودە بووان، تەنانەت لەسەر ئاستی پلانی تەندروستیشدا، هێشتا تێگەیشتنێکی ورد بۆ ئەم دیاردەیە لەئارادا نییە. هەموو ئەم نا ڕوونی و ئاڵۆزییە، لەبری ئەوەی ڕێگری بکەن لەبڵاوبوونەوەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر، بەشێوەیەك لەشێوەکان کاردانەوەی پێچەوانەیان لێ دەکەوێتەوە.

\

## ئامانجی ئەم توێژینەوەیە

١) پێشکەشکردنی زانیاری تیۆری و مەیدانی و داتا، لەبارەی مەترسییەکانی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەرو، بڵاوکردنەوەی وشیاری لەبارەی مەترسییەکانی ئالوودە بوون.

٢) هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی قەبارەی ئەم کێشەیە لەنێو چاکسازییەکانی پیاوان و ئافرەتان و نەوجەوانان لەدوو شاری هەرێمی کوردستاندا (هەولێرو سلێمانی).

٣) دەستنیشانکردنی جۆری ئەو مادە هۆشبەرانەی لەلایەن ئالوودە بووان بەکاردێت، بۆ ئەوەی بزانرێت چۆن دەتوانرێت هەم ڕێگری لەبازرگانی پێوەکردنیان بگیرێت، هەمیش بتوانرێت چارەسەری پزیشکییان بۆ دابین بکرێت.

٤) هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەو پاڵنەرانەی دەبنە هۆی ئەوەی خەڵك پەنا بۆ مادەی هۆشبەر ببەن، تێگەیشتن لەبارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیستەمی

خوێنــدن و کاریگــەری بــارودۆخ و گــوزەرانی خــەڵك و، ئــەو تەمەنــەی زووتر دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو مادە هۆشبەرانە.

٥) هەوڵــدان بــۆ زانینـــی تایبەتمەندییـــە دیمــوگرافی و کۆمەڵایـــەتی و سایکۆلۆژی و ئابوورییـەکانی ئـالوودە بـووان بـەمادەی هۆشـبەر، لەسـەر بنەمای کۆکردنەوەی داتا لەنێو چاکسازییەکاندا.

٦) یارمەتیـدانی پەرلـەمان و حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و دەزگاکـانی پۆلیس و ئاسایش بەزانیاری و داتای پێویست و دەستنیشانکردنی ڕادەی مەترســـی ئـــالوودە بـــوون بـــەمادەی هۆشـــبەرو، شـــێوازەکانی بەرەنگاربوونــەوەی بڵاوبوونــەوەو، هەوڵــدان بــۆ کۆکردنــەوەی داتــای پێویســـت و نوێکردنـــەوەی ئـــەم داتایانـــە بەشـــێوەیەکی ســـاڵانە، بـــۆ تێبینیکردنـی ڕێـژەی زیـاد بـوون، یـا کـەمتر بـوونی ئـالوودە بـووان و، پێڕەوکردنی ڕێکاری تازە کە لەگەڵ بنەما نێو دەوڵەتییەکانی مافـەکانی مرۆڤ گونجاو بێت.

٧) ڕەنگــە ئــەم توێژینەوەیــە گــرنگ بێــت بــۆ خســتنەبەر باســکردنی مەترسییەکانی مادەی هۆشبەر لەنێو کۆمەڵگەدا، چونکە لەنێو هـەرێمی کوردستاندا توێژینەوە لەبارەی ئەم دیاردەیە کەم و دەگمەنـە. هـەروەها پێمان وایـە ئـەو داتایانـەی لێـرەدا خراونەتـە ڕوو، ڕەنگـە بـۆ یەکـەمجار بێت داتای نیمچـە ورد لـەم بـوارەدا بڵاوبکرێتـەوە، ئـەوەش یارمـەتیمان دەدات تێگەیشـتنی باشـترمان بـۆ دیاردەکـە هـەبێت و بتـوانین ڕێکـاری باشتر بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێشنیار بکەین.

٨) دوای ئەوەی پەرلەمانی کوردستان یاسایەکی سەردەمییانە دادەنێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە، پێویست دەکات ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بەهاوکاری دامەزراوە فەرمییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، پلانێکی ستراتیژی دوور مەودا دابنێن و، بەشداری بکەن لەهەڵمەتی وشیارکردنەوەو لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە، ئینجا لەمیانەی پێداچوونەوەی ساڵانە بەم پلانە ستراتیژییەدا، دەسکەوت و کەموکوڕییەکان دەستنیشان بکرێن و بەپێی واقیعی تازە، پلانەکە دەسکاری بکرێت و باشتر بکرێت.

## توێژینەوەکانی پێشووتر

یەکێك لەو کیێشە گەورانەی لەکاتی نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، دووچاری لێکۆڵەران هات، بریتی بوو لەنەبوونی سەرچاوە بەزمانی کوردی، نەبوونی هیچ کتێبێك یا لێکۆڵینەوەیەك کە داتای لەخۆ گرتبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە تەنیا ئەم دوو سەرچاوەیەمان لەنێو کتێبخانەکاندا کەوتە دەست، ئەوەی یەکەمیان لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە، ئەوەی دووەمیشیان وەرگێڕانە. بێگومان ڕەنگە لێکۆڵینەوەو کتێبی تریش هەبوو بێت کە ئێمە دەستمان نەکەوتووە، بەڵام نەبوونی سەرچاوەی زۆر لەسەر ئەم دیاردەیە، مانای وایە پێویست دەکات ئێمە لەزۆر لایەنەوە کاری زیاتری لەسەر بکەین.

١) ماددە هۆشبەرەکان و پەتای سەردەم لەڕوانگەی ئایین و یاسا و کەمەڵگا، نووسینی: عەمیدی مافپەروەر ئازاد ئەحمەد شێروانی و

موقەدەمی مافپەروەر کەمەند عوسمان خەیلانی، لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تەبایی، هەولێر، بێ ساڵی چاپ.

٢) بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر، کۆمەڵێك نووسەر، وەرگێڕانی: ئارام مەحمود ئەحمەد، دەزگای ئایدیا، سلێمانی، ٢٠١٨.

## ڕێکارەکانی ئەم توێژینەوەیە

١) ئالوودە بوون دەبێتە هۆی لێکترازاندنی خێزان و بنەماڵە، دابڕان لەنێو خێزان دروست دەکات و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، کە بنەمایەکی گرنگی خێزانی کوردییە، لەبار دەبات. چ ئەوانەی ئالوودە دەبن، چ ئەوانەی بەند دەکرێن، هەست بەتەنیاییەکی زۆر دەکەن و لەبارێکی کۆمەڵایەتی سەختدا دەبن، زۆرجاریش بنەماڵەی ئالوودە بووان دەسبەرداریان دەبن و لەزیندان سەردانیان ناکەن.

٢) کۆمەڵێك فاکتەری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی هەن، پاڵ بەگەنجانەوە دەنێن بکەونە داوی بازرگانان و ئالوودە بن بەمادەی هۆشبەر.

٣) پێوەندیەکی گەورە هەیە لەنێوان لێکترازانی خێزان و ئالوودە بوونی گەنجان بەمادەی هۆشبەر.

٤) ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر یەکێکە لەو تاوانانەی هەردوو ڕەگەزی نێو مێ تێوەی دەگلێن و، وەکو هەندێك جۆرە تاوانیتر نییە کە زیاتر نێرەکان ئەنجامی دەدەن.

٥) گـەنجان زۆرتـر دووچـاری ئـالوودە بـوون بـەمادەی هۆشـبەر دێـن، لەبەرئـەوەی گـەنج حـەز لەتاقیکردنـەوەی شـتی تـازە دەکـات، بۆیـە سەرەتا وەکو تاقیکردنەوە دەست پێدەکات، دواتـر لەسـەری ڕادێـت و دووچاری ئالوودە بوون دێت.

٦) ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕەفتـاری مـرۆڤ و دووچاری کێشەی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەکات.

## میتۆدی ئیشکردن

ئەم توێژینەوەیـە پشـت میتـۆدی تیـۆری و، شـیکاری و، مێـژوویی و، شـێوازی ڕاپرسـی و کۆکردنـەوەی داتـا لـەنێو بەندییـەکانی چاکسـازییەکانی (گـەوران، ئافرەتان، نەوجەوانان) ی هەرێمی کوردستان لەشارەکانی (هەولێرو سلێمانی) دەبەسـتێت. توێـژەران بەباشـیان زانیـوە هـەموو ئـەم میتۆدانـە پێکـەوە بـەکاربێنن، بـۆ ئـەوەی بتـوانن لەلایـەنی مێژووییـەوە شـێوازی هـاتن و بەکارهێنانی مـادەی هۆشـبەر لـەنێو شارسـتانییەتە کۆنـەکان ڕوون بکەنـەوە. ئینجا وەسفێکی جۆرەکانی مادەی هۆشبەرو، شێوازەکانی ئالوودە بـوون بکـەن و، نیشـانەکانی کەسـی ئـالوودە بـوو دەستنیشـان بکـەن. دواتـریش لـەڕێگای فـۆڕمی ڕاپرسـی تایبەتـەوە، زانیـاری و داتـا کـۆ بکەنـەوە، بـۆ تێگەیشـتن لـەو جۆرە مـادە هۆشـبەرانەی لەهـەرێمی کوردسـتان بـەکاردەهێنرێن و کاریگـەری ئالوودە بوون بەسەر ژیانی ئالوودە بووان.

ئینجا لەڕێگای ئەم داتاو زانیارییانەوە تایبەتمەندی ئەو کەسانە دەستنیشان بکەن کە ئالوودە بوون و لەباکگراوندی مەعریفی و ئاستی خوێندەواری و، کۆمەڵایەتی و تەندروستی و سایکۆلۆژییان تێبگەن و، شیکردنەوەی خۆیان لەسەر بنەمای ئەم داتایانە دابڕێژن.

## بواری توێژینەوە

شوێن: شوێنی کارکردنی مەیدانییانەی ئەم توێژینەوەیە، شارەکانی هەولێرو سلێمانییە لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، کە لەباکوور هاوسنووری تورکیایەو، لەخۆرهەڵاتیش هاوسنووری ئێرانە، لەباشووریش هاوسنوورە لەگەڵ شارە سوننە نشینەکانی عێراقی وەکو (موسڵ، تکریت، بەعقوبە).

کات: ئەم توێژینەوەیە لەماوەی نێوان مانگی (٧) تەمموزەوە بۆ مانگی (٩) ئەیلولی ساڵی (٢٠١٩) ئەنجامدراوە.

عەینەی توێژینەوەکە: لەم توێژینەوەیەدا، پشت بەدوو ڕاپرسی بەستراوە، یەکەمیان فۆڕمێکە لەلایەن بەرپرسانی چاکسازی پیاوان و، بەرپرسانی چاکسازی ژنان و نەوجەوانان پڕ کراوەتەوە. تێیدا هەندێك زانیای گشتی لەبارەی ئەو بەندییانە بەدەستهێنراوە، کە لەنێو ئەم چاکسازییانەدا لەسەر ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر گیراون. هەروەها پشت بەفۆڕمێکی تری ڕاپرسی لەنێو عەینەیەکی عەشوایی زیندانیانی نێو ئەم چاکسازییانەو چاکسازی نەوجەوانان بەستراوەو لەلایەن خۆیانەوە، یا بەهاوکاری خۆبەخشەکانمان پڕ کراوەتەوە.

هاوکارانمـــان ئـــەم فۆڕمانـــەیان بردۆتـــە چاکســـازییەکان و بـــۆ یارمـــەتی بەندییـــەکانیان داوە لـــەپڕ کردنـــەوەدا. وەکـــو هـــەر فۆڕمێـــك، هـــیچ نـــاوو ناونیشانێکی لەسەر نەبووە، بەندییـەکانیش ئـازاد بـوون لـەوەی وەڵامـی هـەر پرسـیارێك بدەنـەوە، یـا نەدەنـەوە. بۆیـە لەهەنـدێك شـوێن و لەهەنـدێك پرسیاردا، زانیارییەکانمان بەپێی پێویست نین و کەموکووڕییان تێدایە.

هەروەها پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین بەهۆی ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیـە، وەکو کارێکی ئەزموونی وا بوو لەبارەی کۆکردنەوەی داتاوە، پێمان بـاش بـوو بەچەند فۆڕمێکی کەم دەست پێبکەین، چونکە ئاسان نـەبوو ئـالوودە بـووانی نێو چاکسازییەکان ڕازی بکرێن، بێن ئەم فۆڕمانە پـڕ بکەنـەوە، بەتایبـەتیش ئەگەر زانیمان ئەوە یەکـەمجارە فـۆڕمی ڕاپرسـی لـەنێو بەندییـەکان لـەبارەی ئالوودە بوون پڕ بکێتەوە، بۆییە ئاساییە ئەگگەر بەشێك لەبەندییەکان حـەز نەکـەن ئـەم فۆڕمانـە پـڕ بکەنـەوە، یـا گومانیـان لـەبارەی کۆکردنـەوەی زانیارییەکان هەبێت.

لەنێو چاکسازی گەورانی پیاوان لەشاری هەولێر، جگـە لـەو فۆڕمـە گشـتییەی لەلایـەن کـارگێڕی چاکسازییەوە پـڕ کراوەتـەوە، ئـەوە لەمیانـەی دوو هـەوڵی جیـاوازدا، لـەنێو (١٦٠) سـزادراو بـەمادەی هۆشـبەر ـــ بازرگـانیکردن و بەکارهێنان ـ تـەنیا (٣٣) فـۆڕم پـڕ کراونەتـەوە. لـەنێو چاکسازی ئافرەتـانی شاری هەولێریشدا، جگە لەو فۆڕمە گشتییەی لەلایەن کارگێڕی چاکسازییەوە پڕ کراوەتەوە، تەنیا (١٠) فۆڕم لەلایەن بەندییـەکان پڕکراونەتـەوە، هـەروەها لـەنێو چاکسازی نەوجـەوانانی هەولێریشـدا کـە (١١) بەنـدکراوی تێـدا بـووە بەتۆمەتی ئالوودە بوون، (٩) فۆڕم پڕ کراوەتەوە.

کۆی گشتی بەندییەکانی چاکسازی گەورانی پیاوان لەشاری سلێمانی (١٠٢٩) بەندی بووە. ئەوانەی لەبارەی پرسی مادەی هۆشبەر بەندکرا بوون، ژمارەیان (٣٠٧) بەندی بووە. (١٩٤) سزادراو بەتۆمەتی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر حوکم دراون. هەروەها (١١٣) کەسیش بەتۆمەتی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر حوکم دراون. لەنێو (١٩٤) سزادراو بەتۆمەتی ئالوودە بوون، تەنیا (١٠) کەس فۆڕمی پرسیارەکانی ئێمەیان پڕکردۆتەوەو، وەڵامی پرسیارەکانیان داوەتەوە. هەروەها لەنێو چاکسازی نەوجەوانانی شاری سلێمانی (١٥) بەندی هەبووە، تەنیا (٣) کەس لەو بەندییانە بەهۆی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر بەندکراون، ئەم (٣) بەندییەش فۆڕمی پرسیارەکانی ئێمەیان وەڵامداوەتەوە. بەهیوای ئەوەی لەلێکۆڵینەوەکانی داهاتوودا، کاری زۆرتر لەسەر داتاکان بکەین.

# بەشی دووەم

# دەروازەیەکی تیۆری

**مادەی هۆشبەر چییە؟**

**بریتییە لەهەر مادەیەکی خاو، یا دەرمانێکی گیایی، یا دروستکراو کە هەر مادەیەکی هێمنکەرەوە یا ئارام بەخش لەناوەڕۆکەکەیدا هەبێت و لەخۆی بگرێت. ئەم مادەیە بۆ زۆر مەبەستی جیاواز بەکاربهێنرێت، هەم لەلایەنی پزیشکییەوەو هەمیش لەلایەنی ئالوودە بوون پێیەوەو، ببێتە هۆی خوو پێوەگرتن و ئالوودە بوون و، کار بکاتە سەر هۆش و عەقڵ و بیرکردنەوەو جەستەی ئەو کەسەی بەکاری دێنێت، ئینجا بۆ ماوەیەکی کاتی و کورتخایەن بێت، یا دوور مەوداو درێژخایەن بێت.([1])**

**دیاردەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی ئاڵۆزە، چەند قۆناغێکی جیاواز لەخۆوە دەگرێت و، پشت بەکۆمەڵێك چەمکی جیاواز دەبەستێت، کە ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین جیایان بکەینەوە: ئالوودە بوون Addiction، خراپ بەکارهێنانی دەرمانی پزیشکی Drug Abuse، بەکارهێنانی هەڵەی دەرمانی پزیشکی Drug misuse، بەکارهێنانی نا پزیشکییانە Non medicaluse، پشت بەستن پێیان Dependance، ڕاهاتن لەسەریان Habituation، هەوەسی ژەهراوییبوون**

---

[1]) مادە هۆشبەرەکان و پەتای سەردەم، ئازاد ئەحمەد شێروانی و کەمەند عوسمان خەیلانی، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٥، ل١٤.

Toxicomanie، پشـــــت بەســــــتن بـــــەدەرمان Phamaco Dependence.[1]

مـادە هۆشـبەرەکان بـریتین لـەمادەی سروشـتی، یـا کیمیـایی کـە تێکـەڵاوە لـەمادەی سروشـتی و لەلایـەنی کیمیاییـەوە دەسـکاریان دەکرێـت، یـا مـادەی کیمیـایی تـەواوەو لەتاقیگـەو کۆگاکـان بەشـێوەی دەسـکرد دروسـت دەکـرێن. بەکارهێنانی ئـەم جـۆرە مادانـە لەلایـەن مـرۆڤ، دەبێتـە هـۆی ئـالوودە بـوون، بەشێوەیەك مرۆڤەکان دواتر نـاتوانن دەسـبەرداریان بـبن و هـەموو ڕێگایـەك دەگرنەبەر بۆ بەدەستهێنانیان.

ڕێکخـــراوی تەندروســـتی جیهـــانی لەســـاڵی (١٩٨٢) دا، هـــات پێناســـەیەکی پێشنیارکرد بـۆ مـادەی هۆشـبەر، لـەنێو ئـەم پێناسـەیەدا مـادە پێویستەکانی تەندروسـتی وەکـو دەرمـان، دوور دەخاتـەوەو باسـیان لێـوە ناکـات، تـاوەکو بتوانێت جیاکاری بخاتە نێـوان دەرمـانی پزیشکی و مـادەی هۆشـبەر، چـونکە ئەم دوو بوارە زۆر تێکەڵاوو ئاڵۆزن. بۆیە دێت بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:" بریتییـە لەهـەر مادەیـەکی کیمیـایی، یـا تێکەڵەیـەك لەکۆمـەڵێك مـادەی کیمیایی، کە لەشی مرۆڤ پێویستی پێیـەتی. بـەکارهێنانی ئـەم جـۆرە مادانـە دەبێتە هۆی گۆڕینی فرمانە بایۆلۆژی و بونیادییەکانی لەشی مرۆڤ".[2]

پێناسـەیەکی تـریش هەیـە بـۆ مـادەی هۆشـبەر جـەخت دەکاتـە سـەر ئـەوەی "مادەیەکی سروشتی، یا دروستکراوە، کار لـە لەشـی مـرۆڤ دەکـات و هەسـت و

---

١) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٦.

٢) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٨.

ڕەفتارو هەندێك فرمانی ئۆرگانی دەگۆڕێت. دووبارە بەكارهێنانەوەی ئەم مادەیە، ئەنجامی مەترسیداری لێ دەكەوێتەوە لەسەر تەندروستی جەستەو عەقڵ، كاریگەری خراپیشی بەسەر ژینگەو كۆمەڵگەدا هەیە". بەگشتی لەلای پزیشكان، هەموو دەرمانێكی دەروونی، مادەیەكی هۆشبەری چالاكە، ئەگەر ئەو مادانە هەمان توانای بەخشینی هەستی مادەی هۆشبەریشیان نەبێت.([1])

ئالوودە بوون نەخۆشییەكە كار دەكاتە سەر هۆش و، مێشك و، عەقڵ و، ڕەفتاری كەسیی ئالوودە بوو، بەشێوەیەك ناتوانێت كۆنترۆڵی هەڵس و كەوت و ڕەفتارەكانی خۆی بكات، بەبێ بەكارهێنانی ئەو مادەیەی پێی ئالوودە بووە، ئینجا ئەو مادەیە یاسایی و سروشتی بێت، یا نا یاسایی و كیمایی بێت. ڕەنگە زۆرجار ئالوودە بوون لەئەنجامی بەكارهێنانی مادەی هۆشبەر بێت بۆ كات بەسەر بردن و خۆشییەكی كاتی و جۆرێك لەتاقیكردنەوە، بۆ ئەوەی ئەو كەسە بزانێت چ هەستێك و چێژێكی پێدەبەخشێت.

هەندێكجاریش بەهاندان یا لەژێر فشاری هاوڕێ و برادەراندا، گەنجان بەكارهێنانی ئەم جۆرە مادانە تاقیدەكەنەوەو، لەلایەن ئەوانەوە هان دەدرێن بۆ ئەوەی بەكاریان بێنن، تەنیا ئەگەر بۆ یەكجاریش بێت. خەڵكانی تریش هەن، بەهۆی بەكارهێنانی هەندێك جۆرە مادەی پزیشكییەوە تووشی ئالوودە بوون دێن. زۆرجار فرۆشتنی ئەم جۆرە مادانە بەبێ بڕیاری پزیشك و، لەژێر سەرپەرشتی پزیشك نەبێت، بۆیان نییە بەكاریان بێنن، چونكە بۆ

---

[1]) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٨.

هێورکردنــەوەی ئــێش و ئــازار بــەکاردێن.[1] بــەهۆی زۆری بــەکارهێنانی ئــەو مـادەو دەرمانــە پزیشـکییانەو بـۆ ماوەیـەکی زۆر، کەسـەکە دووچـاری ئـالوودە بوون دێت، دوای ئەوەی پرۆسەی چارەسـەری تەندروستیشـی تـەواو دەبێـت و لەنەخۆشییەکەی چاکیش دەبێتەوە، ناتوانێت دەسبەرداری بـەکارهێنانی ئـەو مادە هۆشبەرانە بێت و لەسەر بەکارهێنانیان ڕادێت.

کێشەی بەکارهێنانی مـادەی هۆشـبەر لەوەدایـە، ئەگـەر مـرۆڤ بـۆ یـەکجاریش بەکاری بێنێت، ڕەنگە فێری ببێت و لەسەری ڕابێت، بۆیە دەشێت سەرەتا بـۆ کات بەسـەربردن و خۆشـی بـەکاری بێنێـت، بـەڵام بەتێپـەڕینی کـات، دەبێتـە خوو و پێیەوە ئالوودە دەبێت. بۆیە مرۆڤ هەرچـەندە زیـاتر مـادەی هۆشـبەر بەکاربێنێت، ئەوەندە زیاتر هەست دەکات پێویستی بەزۆرتـرو زۆرتـر هەیـەو ناتوانێت وازی لێ بێنێت. کاتێك لەسەری ڕادێت و ئالوودەش دەبێت، هەمیشە حەز دەکات بڕی زیاترو، جۆری بەهێزتر بەکاربێنێت. وەستانی لەناکاو بەبێ ئەوەی مرۆڤ لەژێر چاودێری پزیشکدا بێت، وا لەمرۆڤ دەکات هەست بەخاوو خلیسـکی بکـات و، هەمیشـە هەسـت بـەوە بکـات لەلایـەنی جەسـتەییەوە نەخۆشەو تەواو نییە، بۆیە ئەم پرۆسەیە دەبێـت لـەژێر چـاودێری پزیشـکدا بێت و بەقۆناغە سروشتییەکەی خۆیدا تێپەڕیت، ئـەگینا پرۆسـەی وازهێنـان لەئالوودە بوون شکست دێنێت و کەسەکەش بەشـێوەیەکی توونـدتر لـەجاران، دەگەڕێتــەوە ســەر بــەکارهێنانی مــادەی هۆشــبەرو ئــالوودە دەبێتــەوە. بۆیــە کەسیی ئالوودە بوو، پێویستی بەهاوکاری بنەماڵەو خێزان و هاوڕێکانی هەیە،

[1] ) ادمان المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع مايوكلينيك https://www.mayoclinic.org.

تاوەکو بتوانێت ئەم قۆناغە سەختەی ژیانی، بەکەمترین زیانی جەستەیی و دەرونی تێپەڕێنێت.

وشەی هۆشبەر خۆی وەکو چەمکێك، لەوشەی (Narcotic) دێت کە بنەچەکەی بۆ وشەی کۆنی یۆنانی (Narcosis) دەگەڕێتەوەو بەمانای بێهۆشکەر دێت.([1]) دیارە لەنێو زمانی ئینگلیزیدا ئەم وشەیە تەنیا یەك مانا دەبەخشێت و بەشێوەیەکی پزیشکییانە بەکاردێت و کار دەکاتە سەر ئەرك و فرمانەکانی لەشی مرۆڤ.([2]) لەنێو فەرهەنگی ئۆکسفۆردی پوختەدا، بەم شێوەیە باسی مادەی هۆشبەر کراوە:" بریتییە لەو مادە ئەسڵییە سادە پزیشکییانەو، مادە ئۆرگانییەکان و نا ئۆرگانییەکان، کە وەکو مادەیەکی کارا بەکاردێن".([3])

لەنێو زمانی عەرەبیشدا وشەی موخەدیر لەکۆندا، بەمانای شاردنەوە بەکار هاتووە، خدر ـ سڕ بوون، حاڵەتێکە دەست و پێ و لەشی مرۆڤ دەگرێتەوەو سڕ دەبێت. ئیبن ئەعرابی دەڵێت:" خدرە بەمانای قورسبوونی پیاو دێت کاتێك ناتوانێت بەپێوە بڕوات". ئیبن مەنزوریش دەڵێت:" خدر، وەکو ئەوەی مرۆڤ خەواڵوو بێت، خادر کەسێکی بێزارو تەمبەڵە".([4]) لێرە لەنێو

---

١) مادە هۆشبەرەکان و پەتای سەردەم، ئازاد ئەحمەد شێروانی و کەمەند عوسمان خەیلانی، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٥، ل١٦.

٢) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٧.

٣) تاثير المخدرات على العلاقات الاجتماعية عند المراهق، أ. سعيد زيوش، جامعة حسيبة بن بوعلي، بحثر منشور على موقع https://www.univ-chlef.dz.

٤) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٦.

زمانی عەرەبیدا، وشەی موخەدیر بەمانای شاردنەوەو سترکردنی عەقڵ دێت لەئیدراك و جیاکردنەوە، کە مرۆڤ بەهۆی خواردن، یا خواردنەوەیەك تووشی دەبێت. لەنێو ئینسکلۆپیدیای عەرەبیدا، بەم شێوەیە وەسفی مادەی هۆشبەرکراوە:" بریتییە لەو مادەیەی لەنێو مرۆڤ و ئاژەڵدا، دەبێتە هۆی وشیاری لەدەستدان بەرێژەی جیاواز، ڕەنگە بگاتە حاڵەتی هۆش لەدەستدان، ئینجا مردنیش".([1])

لەنێو زمانی کوردیشدا هەردوو وشەی مادە سڕکەرو، مادەی هۆشبەر بەکاردێت. سڕکەر بەو مانایەی مادەیەکە مرۆڤ سڕ دەکات و جووڵانەوەی خاو دەکات. هۆشبەریش بەو مانایەی دەبێتە هۆی بردنی هۆشی و ئاگای لەخۆی نەمێنێت.

هەروەها، بڕوا وایە چەمکی مادەی ڤینەب لەزمانی لاتینی کۆن وەرگیراوەو بەمانای هاشو هووش دێت، بۆیە حەشیش لێرەوە ناوی خۆی وەرگرتووە، چونکە ئەو کەسەی حەشیش بەکاردێنێت، دوای ئەوەی مادە هۆشبەرەکە دەگاتە نێو لەشی، هاشو هووشی زۆر دروست دەکات، چونکە حەشیش لەم مادەیەی ڤینەبە وەردەگیرێت و لەنێو زمانی عەرەبیدا بەمانای ڕووەکی سروشتی، یا گژو گیا بەکاردێت. هەندێك لەلێکۆڵەران پێیان وایە وشەی حەشیش لەبنەچەدا وشەیەکی عیبری کۆنە "شیش" کە بەمانای خۆشی و شادی بەکار هاتووە، لێرەوە ئەم ناوە لەو مادەیە نراوە کە ئالوودە بووانی

---

[1] ) تاثیر المخدرات على العلاقات الاجتماعية عند المراهق، أ. سعيد زيوش، جامعة حسيبة بن بوعلي، بحثر منشور على موقع https://www.univ-chlef.dz.

لەکاتی کێشانی حەشیش هەست بەخۆشی و شادی دەکەن.(١) هەروەها، بڕوا وایە ناوی مۆرفینیش هەر لەناوی مۆرفیۆسی خواوەندی گریکییەوە هاتبێت کە لەلای ئەوان خواوەندی خەون بووە.

لەنێو زمانی فەرەنسیدا وشەی درۆگێ Drogue بەمانای شتێك دێت کە جۆرەکەی خراپە، یا شتێك کە سوودێکی کەمی هەیە، بۆیە لەنێو زۆر بواری نێو زمانی فەرەنسیدا بەکاردێت، ڕەنگە بەمانای ئەو دەرمانە کیمیاییانە بێت کە لەنێو بۆیە دەکرێن، لەدەرمانخانەشدا بەمانای ئەو شتانە دێت کە دەبنە هۆی ژەهراوی بوون. بۆیە لەنێو مانی فەرەنسیدا وشەی درۆگێ بۆ هەموو ئەو شتانە بەکاردێت کە خراپن و بەکەڵکی بەکارهێنان نایەن و جێگای متمانە نین. لەسەدی بیستەمدا، ئەم وشەیە بۆ مادەی هۆشبەر بەکار هاتووە.(٢)

## ئالوودە بوون چییە؟

بریتییە لەملکەچی و گوێڕایەڵی و پێویستی بەردەوام بۆ مادەی هۆشبەر، بەشێوەیەك کەسی ئالوودە بوو، ناتوانێت دەسبەرداری ئەو مادەیە بێت و بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەری ڕادێت و بەکاری دێنێت و ناتوانێت خۆی

---

(١) المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع بوابة البحث، بدون اسم الباحث https://www.researchgate.net.

(٢) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٢٧.

کۆنترۆڵ بکات، تاوەکو دەگاتە قۆناغێك تێیدا ناتوانێت بەبێ مادەی هۆشبەر ژیانی ئاسایی خۆی بباتە سەر.([1])

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بەم شێوەیە پێناسەی ئالوودە بوون دەکات:" ئەو حاڵەتە سایکۆلۆژی و ئۆرگانییەیە تێیدا کارلێکردنی مادەی هۆشبەر لەنێو لەشی مرۆڤ دروستی دەکات و، بەهۆیەوە مرۆڤ ناچار دەبێت لەسەری بەردەوام بێت".([2])

کەواتە، ئالوودە بوون، بریتییە لەوەگرتن و بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر، بەشێوازێکی نا ڕێکخراوو بەردەوام، چونکە کەسی ئالوودە، سەرەتا بەڕێکەوت ئەو مادەیە تاقی دەکاتەوە، یا بۆ خۆشی و کات بەسەربردن پەنای بۆ دەبات، یا دەیەوێت لاسایی هاوڕێ ئالوودە بووەکانی بکاتەوە. فێربوونی شێوازەکانی بەکارهێنان و وەرگرتنی مادەی هۆشبەرو، حەزی تاقیکردنەوەی دووبارە، مرۆڤ دووچاری ڕاهاتن دەکات بەو مادانە، بۆیە لەسەرەتادا پێی وایە ئالوودە نابێت و دەتوانێت خۆی کۆنترۆڵ بکات، بەلاّم هێدی هێدی دەکەوێتە داوی ئەو مادانەو ناتوانێت وازیان لێ بێنێت.

## پێناسەی یاسایی بۆ مادە هۆشبەرەکان

بریتین لەمادەی کیمیایی، یا گیایی دەبنە هۆی ئالوودە بوون و کار دەکەنە سەر هۆش و عەقڵ و بیرکردنەوەو جەستەی مرۆڤ و، دەبنە هۆی

---

[1]) تاثیر المخدرات على العلاقات الاجتماعية عند المراهق، أ. سعيد زيوش، جامعة حسيبة بن بوعلي، بحثر منشور على موقع https://www.univ-chlef.dz.

[2]) تاثیر المخدرات على العلاقات الاجتماعية عند المراهق، أ. سعيد زيوش، جامعة حسيبة بن بوعلي، بحثر منشور على موقع https://www.univ-chlef.dz.

ژەهراویکردنـــی کـــۆ ئەنـــدامی دەمارەکـــان. دەستاودەســـتکردن و، چـــاندن و، دروســـتکردنی قەدەغەیـــە، تـــەنیا بـــۆ ئـــەو مەبەســـتانە نـــەبێت کـــە یاســـا دەستنیشانیان دەکات و، نا بێت لەلایـەنی مرۆڤـە بـەکاربهێنرێت، تـەنیا دوای وەرگرتنی مۆڵەتی یاسایی نەبێت.(1)

هەر لەلایەنی پێناسەی یاساییەوە، مادەی هۆشبەر وا وەسفکراوە کـە بریتییـە لەکۆمەڵی ئەو مادانـەی ئامـادە دەکـرێن، یـا قەدەغـەکراون لـەوەی مامەڵـەیان پێبکرێت، یا بچێنرێن، یا دروستبکرێن، تەنیا بۆ مەبەستی ئاسایی نەبێت کە یاســا دیاریــان دەکــات، لەبەرئــەوە دەبێــت لەلایــەنی دەوڵەتــەوە مۆڵــەتیان پێبـدرێت، چـونکە ئەوانـە مـادەی کیمیـایین و دەبنـە هـۆی خەوبردنـەوە، یـا خەوتنی نا سروشتی، یا لەدەسـتدانی هـۆش بـۆ کەمترکردنـەوەو سـووککردنی ئێش و ئازار".(2)

## مادە هۆشبەرەکان دوو جۆرن

یەکەم، مادە هۆشبەرە سروشتییە گیاییەکانن، کـە ڕاسـتەوخۆ لەگـەڵاو گـوڵ و گیاو ڕووەك پێکهاتوون و، لەدروستکردن و بەرهـەمهێنانی مـادە هۆشـبەرەکان بەکار دێن.

________________

١) مادە هۆشبەرەکان و پەتای سەردەم، ئازاد ئەحمەد شێروانی و کەمەند عوسمان خەیلانی، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٥، لـ١٥.

٢) تاثير المخدرات على العلاقات الاجتماعية عند المراهق، أ. سعيد زيوش، جامعة حسيبة بن بوعلي، بحثر منشور على موقع https://www.univ-chlef.dz.

**دووەم، بـریتین لـەو مـادە دروسـتکراوە کیمیاییانـەی هـیچ جـۆرە مادەیـەکی هۆشبەری سروشـتیان تێـدا نییـە، بـەڵام هـەمان خەسـڵەت و کاریگەرییـەکانی مادەی هۆشبەری سروشتیان هەیە.([1])**

## مادەی هۆشبەرەکان کامەن؟

**بـریتین لـەو مادانـەی دەبنـە هـۆی ئـالوودە بـوونی مـرۆڤ لەسـەریان، ئینجـا سروشتی بن، یا دەسکردوو کیمیـایی. بەگشـتی مـادەی هۆشـبەر بریتییـە لـەو مادانــەی خــوارەوە: مــادە کحولییــەکان بەگشــتی، ئــەمفیتامین ــ مــادە وزە بەخشــەکان،([2]) پــارابیتوری وەکــو ڤــالیۆم، میتــادۆن([3]) و هــەموو مــادە هێمنکەرەوەکان، ڤینەب و ماریجوانا ـ مادەی حەشیشە، بەڵام بەوشـککراوی ــ**

---

١) مادە هۆشبەرەکان و پەتای سەردەم، ئازاد ئەحمەد شێروانی و کەمەند عوسمان خەیلانی، بێ شوێنی چاپ، ٢٠١٥، لـ١٥.

[2]) ئەمفیتامینەکان یا مادە وزە بەخشەکان لەلایەن زانایەکی ئەلمانی بەناوی ئیدیلیانۆ لەساڵی (١٨٨٧) لەکارگەو تاقیگە بەرهەمهێنراوەو دروستکراوە. جۆری زۆری هەیە وەکو: ئەلیکسا فیتین و، میتافیتامین و، دتیالین و، کتاجۆن و، یۆنات. یۆنات خۆیشی جۆری زۆری هەیە وەکو: دنکسا مفیتامین و، مفیتامین و، میتامفیتامین رینالین. مادەیەکی تریش هەیە بەناوی تیمنیرازین کە پێکهاتەکەی جیاوازە، بەڵام هەمان فرمانی ئەمفیتامینەکانی هەیە. ئەم جۆرە مادانە، یا لەڕێگای دەمەوە وەردەگیرێن، یا لەڕێگای دەرزی لێدان لەدەمارەکان، هەروەها دەکرێت لەڕێگای بۆنکردنیش وەربگیرێن. بەکارهێنانی ئەم جۆرە مادە وزە بەخشانە دەبێتە هۆی: کۆنترۆڵکردنی کێشی لەشی و، زۆرتر بوونی چالاکی لەش و، زۆرتربوون و کاراتر بوونی کاری مێشک و عەقڵ، مرۆڤ وریا دەکەنەوەو ماندووبوونیش ناهێڵن.

[3]) سەرەتا وەکو ئەلتەرناتیڤی مۆرفین بەکارهێنراوە بۆ لەناوبردنی ئێش و ئازاری سەربازانی ئەلمانی لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا، دوای ماوەیەك دەرکەوت مرۆڤ دووچاری ئالوودە بوون دەکات، بەتایبەتیش ئەگەر نەخۆش زیاتر لەڕێژەی پێویست بەکاربێنێت. لەسەر هەردوو شێوەی حەب و دەرزی دروست دەکرێت. زۆر مادەی هۆشبەری لێ هەڵدەهێنجرێت و دروست دەکرێت وەکو: کێتۆپێمیدۆن Ketopemidone، فۆنۆپێریدین Phonoperdine، ڤیتتیل ، ئێتۆرفین Etorphine، دیپیپانۆن Dipipanone.

**لەخۆرئاوادا باون. پاپونج و گانگاو کاراس لەهیند بڵاون، کییف لەباکوری ئەفریکادا باوە، حەشیش Cannabis Saliva([1]) لەمیسرو هەندێك وڵاتانی عەرەبی، کۆکایین کە لەڕووەکی کۆکا Erythrosylon coca دروست دەکرێت و بەزۆر شێوەی جیاواز بەکاردێت و،([2]) مادە وڕێنەکەرەکانی وەکو: لیسیرگایدو، میسکالین و سایلۆسیبین.**

**قات کە لەوڵاتی یەمەن باوە، ئەفیون Opium و مۆرفین و هیرۆیین و کۆکایین کە لەئەمریکای لاتینی باون و، لەزۆر وڵاتی تریش بەکاردێن. ئەو**

---

[1]) کاغەزو لقەکەی وشك دەکرێنەوەو لەسەر شێوەی جگەرە دەپێچرێنەوەو لوول دەدرێن. هەر لەحەشیش مادەیەکی تر دەردەهێنرێت کە ناوی لێنراوە ڕوونی حەشیش و لەئەنجامی بەدلۆپەکردنی حەشیشی تەڕەوە دەست دەکەوێت. حەشیش یەکێکە لەمادە هەرە باوەکان و زیاتر لەلای گەنجان باوەو وەکو جگەرە دەیکێشن. بەردەوام بوون لەسەر کێشانی حەشیش دەبێتە هۆی تێکچوونی باری دەروونی و، دڵەڕاوکێ و دەست لەرزین و ئارەقەکردنی زۆرو، هێڵنج هاتنەوەو ئاڵۆزبوونی سیستەمی خواردن و تێکچوونی خەوی لێ دەکەوێتەوە، بەتایبەتیش ئەگەر زیاد بکێشرێت. ئەوانەی حەشیش دەکێشن، سەرەتا هەست بەحەسانەوە دەکەن، دواتر پێکەنینی زۆر دایاندەگرێت و بیرۆکەی نا عەقڵانییانەیان بەخەیاڵدا دێت، پاشان یادەوەرییان دەشێوێت و هەست بەمەزنێتی و قارەمانێتی دەکەن. ئینجا هەستەکانیان ئاڵۆز دەبێت و وا هەست دەکەن کات زۆر بەهێمنی و لەسەرەخۆ تێدەپەڕێت، ئینجا دووچاری دڵەڕاوکێ دێن. دوای نزیکەی دوو کاژێر بەسەر کێشانی حەشیشدا، زۆر خۆر دەبن، دەوویان وشك دەبێت، دڵیان تووند لێدەدات.

[2]) لەئەمریکا جۆرێك لەکۆکایین بڵاوە کە پێی دەگوترێت کراك crack، بریتییە لەو کۆکایینەی لەکلۆریدراتی پۆدرەیی دەردەهێنرێت، ئینجا تێکەڵ دەکرێت بەکاربۆناتی سۆدای وشك و، زوو بەهەڵم دەبێت و کاریگەرییەکانیشی زوو دەردەکەون، بۆیە ئەوانەی مادەی کراك بەکاردێنن، تووشی تەنگە نەفەسی و ژانی سینە دێن و دڵیان بەشێوەیەکی سروشتی لێنادات و دەشڵەژێن. کاریگەری بەکارهێنانی کۆکایین ئەگەرچی خێرایە، بەڵام بەخێراییش نامێنێت و زۆر درێژە ناکێشێت.

مادانەی بۆن دەکرێن وەکو ئەسیتۆن و گازۆلین.(١) هەروەها لەوڵاتی یەمەن و سۆمال و حەبەشە، مادەی هۆشبەری قات زۆر باوەو بەکاردەهێنرێت.(٢)
بێگومان، مادە هۆشبەرەکان زۆر لەوانە زیاترن کە لێرەدا خستوومانەتە ڕوو، بەشێوەیەك تەنیا باسکردنی جۆرەکانی و، کاریگەرییەکانی، پێویستی بەتوێژینەوەیەکی تایبەت هەیە. لێرەدا پێویست دەکات باسی ئەوەش بکەین کە هەموو مادەیەك کافاینی Caffeine تێدا بێت، بەجۆرێك لەمادەی هۆشبەر دادەنرێت، بەڵام ئەو مادانە بەهۆشبەی بچووك دادەنرێن وەکو چایەو قاوە.
بڕوا وایە مێژووی چایە لەچین زۆر کۆن بێت و بۆ نزیکەی هەزار ساڵ پێش زایینی دەگەڕێتەوە، بەڵام قاوە مێژووەکەی نوێترە. دیارە چایەو قاوە دوو مادەی وریاکەرو وزە بەخشن و کار دەکەنە سەر مێشك و وریاتری دەکەنەوەو

---

(١) المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع بوابة البحث، بدون اسم الباحث https://www.researchgate.net.

٢) قات بریتییە لەگەڵای درەختێکی تەمەن درێژ، بەرزییەکەی لەنێوان یەك مەتر بۆ دوو مەتردایەو، هەمیشە سەوزە. گەڵای سەوزی قات کۆ دەکرێتەوەو لەناو دەم دادەنرێت لەنێوان ڕوومەت و شەویلاکەکان و پێی دەڵێن عەمبارکردن. قات مادەیەکی کارای تێدایەو مرۆڤ خاو دەکاتەوە وەکو ئەوەی خەون ببینێت، مادەی قات پێی دەگوترێت قات نۆر پسیۆدۆ ئیفێدرین kaht Nor pseudo Ephedrine، یا پێی دەگوترێت قاتیت یا کاتین. لەکاتی مژینی بۆن و تامی قاتدا، کەسەکە هەست بەخۆشی دەکات و کێشەکانی خۆی بیر دەچێتەوە، تەنانەت هەست بەبرسێتیش ناکات، بەڵام دوای چەند کاژێرێك، خاو دەبێتەوەو مێشکی بەشێوەیەکی سروشتی کار ناکات و دووچاری قورسی هەرسکردن و قەبزی و هەوکردنی گەدەو بەرز بوونەوەی فشاری خوێن دێت، لەگەڵ کۆمەڵێك شڵەژانی دەروونی و جۆرێك لەخەمۆکی.

دەبنە هۆی نەخەوتن، بۆیە توێژینەوەکان پێیان وایە زێدەڕۆییکردن لەسەر خواردنەوەی چایەو قاوە، زیانبەخشە.([1])

بەپێی ئامارێك کە لەساڵی (١٩٨٧) ئەنجامدراوە، ژمارەی مادە هۆشبەرەکان لەسەرووی (٥٠٠) مادە دەبێت، هەموویان هەمان کاریگەرییان هەیە بەسەر کەسی ئالوودە بوو و، کێشەی تەندروستیان لێ دەکەوێتەوە. لەبەرئەوەی زۆر جۆری مادەی هۆشبەر هەیە، هەندێك لەتوێژەران وایان بەباش زانیوە بێن ئەو مادانە پۆلێن بکەن، تاوەکو ئاسانتر بتوانن لەیەکتریان جیا بکەنەوە. یەکێك لەم پۆلێنکردنانە، لەلایەن دکتۆرێکی دەرمانخانەی ئەڵمانی پێشنیارکراوە بەناوی لێڤین Lewin کە پشت بەکاریگەری مادە هۆشبەرەکە دەبەستێت، بۆیە هاتووە پێنج کۆمەڵە مادەی هۆشبەری، بەپێی کاریگەرییەکەیان جیا کردۆتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: ئەو مادانەی مرۆڤ دڵخۆش دەکەن Euphorica.

دووەم: ئەو مادانەی وڕێنە لەلای مرۆڤ دروست دەکەن Phantastica.

سێیەم: ئەو مادانەی مرۆڤ مەست دەکەن Inebriantia. بریتین لەهەموو ئەو مادانەی مرۆڤ مەست دەکەن، وەکو جۆرەکانی کحول.

چوارەم: ئەو مادانەی خەوهێنن Hypnotica. بریتین لەو مادانەی مرۆڤ وا لێ دەکەن زوو خەوی لێبکەوێت.

پێنجەم: ئەو مادانەیورووژێنەرن Excitantia. بریتین لەو مادانەی دەمارەکان دەورووژێنن، وەکو قاوەو قات.([1])

---

[1]) المخدرات وأثارها النفسية والاجتماعية والاقتصادية في دول مجلس التعاون لدول الخليج العربية، د. خالد حمد المهندي، الدوحة، ٢٠١٣، ص٤٢.

بێگومان جۆرێك پۆلێنی تریش هەیە كە زیاتر پشت بەلایەنی سروشتی مادەی هۆشبەر دەبەستێت، بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە گوایە دوو جۆرە مادەی هۆشبەر هەیە، یەكەمیان سروشتییە، دووەمیان دروستكراوە.
لەساڵی (١٩٦١) بەپێی ڕێككەوتنێكی نێو دەوڵەتی، نەتەوە یەكگرتووەكان (١٠٠) جۆرە مادەی هۆشبەری دەستنیشانكردوو داوایكرد بخرێنە ژێر چاودێری نێو دەوڵەتی، لەنێو ئەم ژمارەیەدا، (٧٠) دانەیان مادەی بێهۆشكەری كیمیایی و دروستكراو بوون، سروشتی نەبوون.([٢])

## شێوازەكانی ئالوودە بوون

یەكەم: ڕێكەوت. واتا كەسی ئالوودە بوو، سەرەتا گرنگی بەم بابەتە نادات، بەڵام لەناوەوە حەزێك هەیە بۆ تاقیكردنەوەی شتی جیاوازو مادەی جیاواز، حەز دەكات بزانێت مادەی هۆشبەر چییە؟ چۆن بەكاردێت؟ چ جۆرە كاریگەرییەكی هەیە؟ بۆیە ڕەنگە هەر بەڕێكەوت لەشوێنێك بێت، كە مادەی هۆشبەری تێدا بەكاردێت، ئەویش لەژێر فشاری هاوڕێكانی و هەبوونی حەزی تاقیكردنەوەی شتی جیاواز، حەز دەكات خۆی تاقی بكاتەوە. دەشێت ئەم تاقیكردنەوەیە جارێك، یا چەند جارێكیش بێت، بەڵام دواتر وازی لێ دێنێت. یا ڕەنگە ببێتە دروازەیەك بۆی بۆ ئەوەی بچێتە نێو ئەم جیهانە مەترسیدارو، لەسەری ڕابێت. لەم شێوازی ڕێكەوتەدا، هەردوو ئەگەر هەیە،

---

١) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٤١.
٢) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص٤٢.

ئەگەری ئەوەی وازی لێ بێنێت و بەلایدا نەچێتەوەو، ئەگەری ئەوەی فێری بێت و ئالوودە بێت.

دووەم: بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر لەبۆنەکاندا. بریتییە لەبەکارهێنانی مادەی هۆشبەر لەهەندێك بۆنەی تایبەتی وەکو: جەژن، جەژنی لەدایکبوونی هاوڕێیەك، جەژنێکی نیشتیمانی، جەژنێکی ئایینی، یا هەر بۆنەیەکی تری کۆمەلایەتی وەکو گەشت و سەفەرو پێکەوە مانەوە، هەر بۆنەیەك خەڵك تێیدا پێکەوە کۆ دەبنەوەو شتی هاوبەش تاقیدەکەنەوە. لەم بۆنانەدا، دەشێت هەندێکجار مادەی هۆشبەر بەکاربێنێت. لێرەدا ڕەنگە ئەوە ببێتە خوو و لەسەری بەردەوام بێت، یا دەشێت وازی لێ بینێت و تەنیا لەم جۆرە بۆنانەو، لەگەڵ هەندێك هاورێی دیاریکراو بەکاری بێنێت.

سێیەم: ئالوودە بوونی ڕێکخراو. بریتییە لەوەی کەسێك ڕابێت لەسەر بەکارهێنانی جۆرێکی دیاریکراوی مادەی هۆشبەرو بەشێوەیەکی ڕێکخراو، بۆ ماوەیەکی زۆر بەکاری بێنێت. ئەم بەکارهێنانە دەکەوێتە ژێر باری پێویستی ئەو کەسە بەو مادەیە. ئەم قۆناغە، بەقۆناغێکی پێشکەوتوو و مەترسیدار دادەنرێت بۆ کەسی ئالوودە بوو، چونکە لەلای بۆتە خوو و، بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەسەری بەردەوام دەبێت و ناتوانێت وازی لێ بێنێت.

چوارەم: ئالوودە بوونی چڕ. ئەم جۆرە ئالوودە بوونە خراپترین جۆرەو گوزارشتە لەوەی کەسی ئالوودە بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر مادەی هۆشبەر

بـەکاردێنێت و، بۆتـە خـووێکی ڕۆژانـەو، چـیتر ناتوانێـت وازی لێ بێنێـت و، ناتوانێت کۆنترۆڵی ژیانی خۆی بکات. بۆیە، بەشێکی زۆری کاتی خۆی بۆ گەڕان و هەوڵدان بۆ پەیدا کردنی مادەی هۆشبەر بەکاردێنێت و خەریکی بەکارهێنانی دەبێت. لێرەدا ئالوودە بوو دەکەوێتە نێو خانەی قۆناغی یەکەمی ئالوودە بوون و، بەبێ مادەی هۆشبەر، لایەنی سایکۆلۆژی ئالۆز دەبێت.

پێنجەم: ئالوودە بوونی تەواو لەمیانەی هۆشبەری جیاوازەوە. لەم قۆناغەدا کەسی ئالوودە بوو تەنیا بە بەکارهێنانی یەك مادەی هۆشبەر ڕازی نابێت، بەڵکو پەنا دەباتە بەر هەر مادەیەکی هۆشبەر کە بکەوێتە بەردەستی. هەروەها، ڕۆژانە ئەو مادەیە، یا چەندین مادەی جیاواز، یا تێکەڵ بەکاردێنێت.(1)

## نیشانەکانی کەسیی ئالوودە بوو بەمادەی هۆشبەر.

بەکارهێنەری مادەی هۆشبەر، ئینجا هەر جۆرە مادەیەك بێت، سروشتی و گیایی، یا مادەی هۆشبەری کیمایی، کۆمەڵێك نیشانەی ڕوون و بەرچاوی لێ دەردەکەون و، مرۆڤ کەمێك لێیان ورد بێتەوە، دەتوانێت دەستنیشانیان بکات، چونکە کۆمەڵێك گوڕانکاری بەسەر هۆش و مێشك و عەقڵ و بیرکردنەوەو ڕەفتاریاندا دێت، لەمیانەی ئەم گۆڕانەوە دەکرێت حاڵەتەکەیان دەستنیشان و

---

١) جريمة تعاطي المخدرات في محافظات غزة، دراسة في جغرافية الجريمة، وسام محمد النجار، بحث ماجستير، ٢٠١٢، ص٣٩.

دیاری بکرێت. دەبێت پێش هەموو شتێکیش ئەوە بزانین، کە مادەی هۆشبەر دەبێتە هۆی زیاتر لێدانی ترپەی دڵ و فشار بۆ سەر دڵ دروست دەکات.

بێگومان، مادە هۆشبەرەکان کاریگەری جیاوازییان هەیە بەسەر مرۆڤ، بۆیە مەرج نییە هەموو نیشانەکان لەیەك کاتدا لەگەڵ بەکارهێنانی یەك جۆرە مادەی هۆشبەر دەربکەون، بۆیە ئەوەی ئێمە لێرەدا ئاماژەیان بۆ دەکەین، سیفەت و خاسیەتە بڵاوەکانن، ئەگینا بەشێك لەمادە هۆشبەرە تێکەڵەکان، یا ئەوانەی بەتەواوی کیمیایین، نیشانەی توونودتریان لێ دەردەکەوێت. ئەم گۆڕانکارییانەش لەمیانەی ئەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەخەینە ڕوو:

١) هەستکردن بەوەی پێویستی بەوە هەیە بەشێوەی بەردەوام مادەی هۆشبەر بەکاربێنێت و ناتوانێت واز لەبەکارهێنانیان بێنێت، ئینجا بەشێوەیەکی ڕۆژانە بێت، یا ماوە ماوە.

٢) بیرکردنەوەو هۆشی تەنیا لەلای دەسکەوتن و پەیداکردنی مادەی هۆشبەردایە، بۆیە کەمتر بیر لەشتەکانی دەورووبەری خۆی دەکاتەوە.

٣) بەتێپەڕینی کات، پێویستی بە بەکارهێنانی مادەی هۆشبەری بەهێزتر دەبێت، چونکە جەستەی لەگەڵ مادە هۆشبەرەکانی پێشتر ڕادێن و وەکو جاران کاری لێناکەن، بۆیە پەنا بۆ بەکارهێنانی مادەی هۆشبەری بەهێزترو خراپتر دەکاتەوە.

٤) هەمیشە هەوڵدەدات بڕێك مادەی هۆشبەر لەلای خۆی هەڵبگرێت و لەکاتی پێویستدا بەکاری بێنێت، بۆیە هەوڵی بەدەستهێنانی بڕی زۆرتر دەدات.

٥) بڕێکی زۆری داهات و پارەکانی لەکڕینی مادەی هۆشبەر سەرف دەکات و، ئەولەوییەتەکانی ژیانی خۆی لەبیر دەکات. زۆرجاریش لەبەرئەوەی ئەو کەسانە داهاتێکی کەمیان هەیە، ناتوانن بڕی پێویستی ئەو مادە هۆشبەرانە بکڕن و تووشی قەرزاری و کێشەی لا بەلا دێن.

٦) کەمتر لەجاران بەشداری لەچالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو خێزان و بنەماڵەکەی دەکات، زۆرتر خۆی پەراوێز دەکات و حەز لەتەنیایی دەکات، بەتایبەتیش نەوەکو پێیەوە دیار بێت و ئاشکرا بێت.

٧) کۆمەڵێك گۆڕانکاری فیزیکی و جەستەیی بەسەر هۆش و جەستەیدا دێت، بەهۆی مادەی هۆشبەریشەوە، دووچاری هەندێك نەخۆشی لا بەلا دێت و، زیانی جەستەیی و عەقڵی و دەروونی پێدەگات.

٨) هەندێك کارو ئیش دەکات، کە لەشێوەی سروشتی خۆیدا هەرگیز ئەم کارانەی نەکردووەو لەلای ئەم، وەکو نەریتێکی کۆمەڵایەتی شوورەیی و نەنگی بووە.

٩) ئەو کاتەی لەژێر کاریگەری مادەی هۆشبەردایە، زۆر سەرکێشەو مەترسی زۆر دروست دەکات، بەتایبەتیش لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل و ماتۆڕسکیلدا.

١٠) لەگەڵ هەر ڕووداوێکی نیمچە ئاساییدا، پەرچەکرداری توونددو تیژی دەبێت و، لەلایەنی دەروونییەوە بەهۆی مادە هۆشبەرەکان لەهەڵچووندایەو خۆ کۆنترۆڵکردنی ئاسان نابێت.

١١) هەمیشە لەنێو کەش و هەوایەکی پڕ لەترس و تۆقیندا دەژین، لەترسی ئەوەی لەلای بنەماڵەو خێزانەکانیان، یا هاوڕێکانیان، یا دەزگاکانی

پــۆلیس و ئاسایشــەوە دەســگیر بکــرێن و ســزا بــدرێن. ئــەو فشــارە دەروونییەی ئەم جۆرە ترسە دروستی دەکات، ناچاریان دەکات هەمیشە خۆیان لەبەرچاوان بشارنەوەو لاتەریك و پەراوێز بژین.

١٢) بـەرەنگاری ئـەو کەسـانە دەبنـەوە کـە هـەوڵی یارمەتیـدانیان دەدەن و لـەواقیعی ئـالوودە بوونیـان ڕادەکـەن و ئامـادە نـین بچنە نێـو پرۆسـەی چاکبوونەوە لەژێر سەرپەرشتی پزیشکیدا.

١٣) ئەگــەر قوتــابی بــن، زۆر لەقوتابخانــەو خوێنــدن دادەبــڕێن و نــاتوانن کۆنترۆڵی وانەکانیان بکەن.

١٤) بەشـێکی زۆری ئـالوودە بـووان چـاوەکانیان سـوور هەڵدەگـەڕێت و بنـی چاوەکانیان ڕەش دەبێت، لەلایەنی جەستەییشەوە هەست بەبێتاقـەتی و لاوازی دەکەن، ئەگەرچی هێدی هێدی کێشی لەشیان زیاتر دەبێت.

١٥) کەمتر بایەخ بەشێوەو ڕوخسارو جل و بـەرگی خۆیـان دەدەن، هەمیشە وەکو کەسێکی ئیهمال و بێ تاقەت و ڕەشبین دەردەکەون.

١٦) زۆرجـار شـتیان بـیر دەچـێتەوەو نـاتوانن بـزانن چـیانکردووەو چـیان گوتووە، یا کێیان بینیوەو لەگەڵ کێ بوون.

١٧) بەشـێکی زۆر لەوانــە، دووچـاری خـەمۆکی و نەخۆشـی دەروونـی دێـن و ناتوانن لێی دەربچن.

١٨) ڕێزنەگرتن لەخودی خۆی و بەکەم تەماشاکردنی خۆی و بچووکبوونەوە لەئاست کۆمەڵگەو دەوروبەر.

جگە لەم نیشانانە، زۆرجار بەکارهێنەری مادەی هۆشبەر دووچاری حاڵەتی نەخۆشی کتوپڕ دێت، وەکو گۆڕانکاری قووڵ لەباری هۆش و لەدەستدانی وشیاری تەواو بەخۆی و دەوروبەری، هەندێکجاریش دووچار تەنگە نەفەسی دێت و ناتوانێت بەشێوەیەکی سروشتی هەناسە بدات، ڕەنگە دووچاری دڵەکوتەو ئاڵۆزی لێدانی ترپەی دڵیش بێت و زیاد لەپێویست و ئاسایی دڵی لێبدات. بەشێك لەوانە نیشانەکانی جەڵتەی دڵیان لێ دەردەکەوێت و هەست بەسینگ ئێشان دەکەن، بۆیە پێویستیان بەچارەسەری پزیشکی ڕاستەوخۆ دەبێت.

# بەشی سێیەم

## باکگراوندێکی مێژوویی مادە هۆشبەرەکان

بەگشتی لەنێو کولتوورو شارستانییەتە کۆنەکاندا، بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر نەریتێکی باو بووە، بەتایبەتیش لەنێو بواری پزیشکی و پزیشکی میللیدا، لەبەرئەوەی ئەو مادانە بەشێوەیەکی سروشتی وەکو گژو گیاو ڕووەکی سروشتی ڕواون، بێ ئەوەی مرۆڤ دەستی هەبێت لەچاندن و پەرەپێدانیان. بۆیە مرۆڤی نێو شارستانییەتی کۆن، لەنێو زۆر لەشارستانییەتەکان، سەرەتا ئەم ڕووەك و گژو گیایان بۆ مەبەستی پزیشکی بەکارهێناوە، وەکو هێمنکەرەوەیەك و بۆ کەمتر کردنەوەی ئازار یا سووککردنی و لەناو بردنی هەندێك جۆرە ئێش و ئازاری نێو جەستەی مرۆڤ.

بەکارهێنانی ئەم جۆرە مادانە مێژوویێکی دوروودرێژی هەیە، بەڕەچاوکردنی ئەوەی مرۆڤ لەنێو شارستانییەت و کولتووورە جیاوازەکان، وەکو سەرچاوەیەکی سروشتی ڕەفتاریان لەگەڵ ئەم مادە هۆشبەرانە کردووەو، لەپێناو گەشەپێدانی بواری پزیشکیدا بەکاریان هێناوە، بێ ئەوەی هەوڵبدەن سروشتی گوڵ و ڕووەك و گژو گیاکان دەسکاری بکەن. بۆیە، بەگشتی بڕوا وایە زیاتر لەپێنج هەزار ساڵە مرۆڤ ئەم ڕووك و مادە هۆشبەرانە دەناسێت و، بەشێوەو بۆ مەبەستی جیاوازیش بەکاری هێناوە.

دیارە لەم قۆناغە مێژووییە کۆنەو تا سەردەمانێکی درەنگیش، وا تەماشای بەکارهێنانی ئەم مادە هۆشبەرانە نەدەکرا گوایە کێشەی تەندروستی و ئابووریيان لێبکەوێتەوەو، پێویست بکات دەسەڵاتە فەرمییەکان کۆنترۆڵی بکەن، تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم نەبێت. بۆ نموونە، لەساڵی (١٩٧٩) دا، ساڵانە لەئەفغانستان (٢٠٠) تۆن مادەی ئەفیون بەرهەم دەهێنرا، بەڵام ئەم ڕێژەیە لەساڵی (١٩٩٩) دا، بەرز بۆتەوەو گەیشتۆتە (٤٦٠٠) تۆنی ساڵانە.

لەساڵی (١٩٨٠) دا، بەرهەمهێنانی کۆکایین لەسەر ئاستی جیهان لەنێوان (٥٠٠ ــ ٧٠٠) تۆندا بووە، بەڵام لەساڵی (١٩٩٦) دا، ئەم ڕێژەیە بەرز بۆتەوەو گەیشتۆتە نێوان (٨٠٠ ــ ١٢٠٠) تۆن لەساڵێکدا. ئەڤیۆنیش لەساڵی (١٩٨٨) دا ڕێژەی بەرهەمهێنانی ساڵانەی لەنێوان (٨٠٠ ـ ١٠٠٠) تۆن بووە، کەچی لەساڵی (١٩٩٦) دا، گەیشتۆتە (٤٥٠٠) تۆن لەساڵێکدا.([1]) ئەوە تەنیا لەوڵاتێکی وەکو ئەفغانستاندا، بێگومان زۆر وڵاتی تریش هەن پەرەیان بە بەهەرمهێنانی مادەی هۆشبەرداوە، لەبەرئەوەی سامانێکی زۆر بەدەست دێنێت و بازرگانییەکی گەورەیە.

بێگومان ئێمە دەزانین ئاوی جۆ ـ بیرە، یەکێکە لەو مادە هۆشبەرانەی هەر لەمێژوویکی زووەوە لەنێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، لەنێو زۆربەی شارستانییەتە کۆنەکاندا باو بووە. لەهەمان کاتیشدا لەنێو بەشێکی زۆری شارستانییەتەکانیشدا شەراب یەکێك بووە لەو مادە هۆشبەرانەی بەفراوانی بڵاوبۆتەوە، تەنانەت لەنێو شارستانییەتی گریکی کۆندا، جەژنی تایبەت

١ ) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص١٢.

هەبووە بەخواردنەوەی شەراب و بۆ چەندین ڕۆژ مرۆڤەکان لەسەر شەقام و کووچەو کۆڵانەکاندا، پێکەوە شەرابیان خواردۆتەوە. چینییە کۆنەکانیش لەڕێگای تەخمیرکردنی برنجەوە جۆرێکی تایبەتی بیرەیان دروستکردووە، لەپاڵ تەخمیرکردنی پەتاتەو گەنم و جۆدا.

لەنێو هەندێك لەکاغەزەکانی پاشماوەی شارستانییەتی میسری کۆندا، شێوەی گوڵ و گژو گیاکان هەن و کێشراون، کە وەکو مادەی هۆشبەر بەکارهێنراون، لەنێو هەندێك لەمیتۆلۆژیاکانیشدا باسیان لێوە کراوە. بۆیە، بڕوا وایە میسرییە کۆنەکان لەسەدەی چوارەمی پێش زایینیدا مادەی ئەفیۆنیان وەکو دەرمانێك بۆ سووککردنی ئێش و ئازاری نەخۆش بەکارهێنا بێت.

لەنێو یاداشتەکانی هیرۆدۆتیش باسی ئەوە کراوە گوایە میسرییەکان لەسەردەمی فیرعەونەکان، حەشیشیان بەکارهێناوەو لەلای ئافرەتێکی سۆزانییەوە فرۆشراوە کە ناوی رادۆبیس بووەو، شەوی سوورو شین ـــ حەشیشە کێشان ـــ ی ڕێکخستووەو، خەونی ئەوەی هەبووە هەرەمێکی گەورەی وەکو هەرەمی خۆفۆ بۆ خۆی دروست بکات، تەنانەت باسی ئەوەش کراوە گوایە ئەم ئافرەتە بەپارەی فرۆشتنی حەشیش، هەرەمێکی بچووکی دروستکردووە.(1)

هیندییە کۆنەکان پێیان وابووە شیڤای خواوەندی هیندی، خۆی ڕووەکی قینەب لەنێو ئاوی زەریاوە بۆ مرۆڤ دێنێت، مرۆڤیش لەم ڕووەکەوە حەشیش بەرهەم دێنێت بۆ ئەوەی لەبواری پزیشکیدا سوودی لێوەر بگیرێت. کاهین و

---

١) المخدرات وأثارها النفسية والاجتماعية والاقتصادية في دول مجلس التعاون لدول الخليج العربية، د. خالد حمد المهندي، الدوحة، ٢٠١٣، ص٢٠.

پیاوانی کۆنی هیندی ڕووەکی ڤینەب ـ حەشیش یان وا تەماشاکردووە گوایە بنەچەیەکی خواییانەی هەیە، چونکە کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر بێ هۆشکردنیان و لەنێو ئاهەنگ و جەژنە ئایینییەکان بەکاریان هێناوەو، لەنێو هەندێك میتۆلۆژیای هیندی کۆنیشدا وا وەسفکراوە گوایە خۆشەویستترین شەرابە لەلای "ئەندرا" ی خواوەنددا. تا ئێستاش ئەم ڕووەکە لەنێو هەندێك پەرستگای هیندۆسی لەسیخ و نیپال و پێڕەوکارانی "شیتا" ی خواوەند، لەکاتی جەژنە پیرۆزەکانیان، بەکار دەهێنرێت.([1])

سۆمەرییەکانیش مادەی هۆشبەری ئەڤیۆنیان ناسیوە، بۆیە لەنێو یەکێك لەنووسینە سۆمەرییە کۆنەکاندا کە مێژووەکەی بۆ (٣٣٠٠) ی پێش زایینی دەگەڕێتەوە، باسی وەرزی درۆینەکردنی ئەڤیۆن دەکات. بۆیە مادەی هۆشبەر مێژوویێکی کۆنی هەیە لەمیزۆپۆتامیادا، دوای ئەوانیش بابلی و فارسەکانیش ئەو جۆرە مادانەیان ناسیوەو بەکاریانهێناوە.

لەنێو ئەفسانەی گلگامێشی سۆمەریشدا، دەبینین کاتێك گلگامێش بەهۆی نەخۆشکەوتن و مردنی ئەنکیدۆی هاوڕێی، حاڵی پەرێشان و سەرگەردان دەبێت، بەنێو دەشت و چۆڵ و بیاباندا دەگەڕێت، بۆ ئەوەی ڕووەکی ژیان بدۆزێتەوەو نەمری بەدەست بێنێت، دەگاتە مەیخانەیەکی بچووك و لەوێدا پیرە ژنێك کە خاوەنی مەیخانەکەیە، مەی دەگێڕێت و دەیداتە مێوانەکانی، کاتێك بارو ڕەوشی گلگامێش دەبینێت ئەوها وێران بووە، داوای لێ دەکات بیر لەهیچ نەکاتەوەو ئاوی جۆ ــ بیرە بخواتەوەو ئەوەندەی لەژیان ماوە،

---

١ ) المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع بوابة البحث، بدون اسم الباحث https://www.researchgate.net.

بەمەستی و خۆشی بەسەر ببات، تاوەکو کارەساتی لەدەستدانی ئەنکیدۆی هاوڕێی لەبیر بچێتەوە.

گریکەکانیش ئەم شێوە مادە هۆشبەرانەیان ناسیوەو وێنەی ڕووەکی خەشخاشیان لەسەر دیواری گۆڕستان و پەرستگاکان نەخشاندووە، بۆیە پێدەچێت ئەوانیش وەکو ڕووەکێکی پیرۆز تەماشای خەشخاشیان کردبێت کە لەتوانایدایە مرۆڤ ئالوودە بکات و لەهۆشی ببات. بەڵام، گریکەکان بەچەندین مانای جیاواز ڕووەکی خاشخاشیان کێشاوەو دەلالەتی جیاوازیان پێداوە، ئەوەش بەپێی سیفەتی خواوەندەکان لەلای ئەوان، لەگۆڕاندا بووە. بۆیە دەبینین لەنێو دەستی هێرای خواوەنددا، بەمانای بەپیتی و منداڵبوون و دایکایەتی بەکار هاتووە. لەکاتێکدا ئەگەر لەنێو دەستی دیمیتری خواوەنددا بوو بێت، ئەوە بەمانای خێرو بەرەکەتی زەوی بەپیت بوونی زەوی بەکار هاتووە. لەنێو دەستەکانی بلۆتۆی خواوەندیش، مانای خەوتنی هەمیشەیی، یا مەرگ و مردن بووە.

لەنێو میتۆلۆژیاو داستانەکانی گەلانی ناوچەی ئەندێزی ئەمریکاو هیندییەکانی ئینکا، چیرۆك و داستانێکی تایبەت بەهاتنە خوارەوەی مادەی هۆشبەر هەیە لەئاسمانەوە بۆ سەر زەوی، وەکو ئەوەی ئەم مادە هۆشبەرانە دیاری خواوەند بێت بۆ مرۆڤ، تاوەکو لەچارەسەری نەخۆشیدا بەکاری بێنن. بۆیە دەبینین بەپێی ئەم ئەفسانەیە، ئافرەتێك لەئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ ئەوەی کارێکی وا بکات ئێش و ئازارو تلانەوەو پەرێشانی مرۆڤ کەم بکاتەوە، لەگەڵ خۆیدا جۆرێك لەمەستی و خەوێکی قووڵی هێناوەو دابەشیکردووە بەسەر مرۆڤەکاندا. لەدرێژەی چیرۆکەکەدا، ئەم ئافرەتە خۆی

لەسایەی هێزێکی خواییەوە، دەبێتە درەختی کۆکا([1]) ــ کۆکایین کە یەکێکە لەمادە هۆشبەرەکان.

بڕوا وایە چینییەکان زۆر پێش زایینی مادەی ڤینەبیان ناسیبێت و بەشێوەی جیاواز لەنێو ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا بەکاریان هێنا بێت و، داوی دروستکردنی پەت و، جۆرێك لەقوماشیان لێ دروستکردووە، هەرەها لەبۆنە ئایینییەکانیشدا، بۆ مەستبوون و خۆشی بەکاریان هێناوە. بڕوا ویە ئیمپراتۆری چینی (شن ننگ) لەساڵی (٢٧٣٧) ی پێش زایینیدا، بڵاوبوونەوەی ئەم مادە هۆشبەرەی پەرپێداوەو بەشێوەیەکی فەرمی ڕێگای بەکارهێنانیداوەو، ناویشی لێناوە خۆشی بەخش. بەڵام، هیندییە کۆنەکان ناویان لێنا بوو خەمرەوێن.

لەسەدەی حەوتەمی پێش زایینیشدا، ئاشورییەکان مادەی هۆشبەریان لەنێو جەژن و ئاهەنگە ئایینییەکانیان بەکار هێناوەو ناویان لێناوە ڕووەکی "کۆنۆبۆ"، بۆیە ليناوس کە ڕووکناس بووە، لەساڵی (١٧٥٣) دا، ئەم ناوەی لەئاشوورییەکان وەرگرتووەو ناوی ڤینەبی کردووەتە "کەننابیس Cannabis).([2])

هەر لەسەدەی هەشتەمی زایینییەوە، عەرەب و ئیسلامەکان مادەی حەشیش و ئەڤیونیان ناسیوەو بەکاریان هێناوە، بۆیە دەبینین زانای ناودار ئیبن سینا پێشنیاری کێشانی ئەم مادەیە دەکات بۆ چارەسەری جۆرێکی دیاریکراوی

---

[1]) المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع بوابة البحث، بدون اسم الباحث https://www.researchgate.net.

[2]) المخدرات، بحث منشور على الانترنت في موقع بوابة البحث، بدون اسم الباحث https://www.researchgate.net.

نەخۆشـــی. لەســـەدەی یـــازدەی زایینیـــدا، حەســـەن ســـەباحی ســـەرکردەی قرمتییـەکان لەئاسـیای ناوەڕاسـت، حەشیشـی بـەکارهێناوەو وەکـو پاداشـت بەخشـیویەتییە سـەربازو سـەرکردەکانی، بۆیـە ئـەم گرووپـە لـەنێو مێـژووی ئیسلامیدا، زۆرجار بەحەشیشە کێشەکان ناو دەبرێن.

لەســـەدەی چـــواردەی زایینیـــدا، ڕووەکـــی قـــات لەیەمـــەن و حەبەشـــەدا بڵاوبۆتـەوەو، مـەقریزی (١٣٦٤ ــ ١٤٤٢) لـەنێو یاداشـتی گەڕانـەکانی خۆیـدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەیەمەن و حەبەشەدا، درەختێك هەیـە هـیچ بـەرو بوومێکی نییەو ناوی قاتە، خەڵك دەچن گـەڵا سـەوزو بچووکەکانی دەخەنـە نێـو دەمیـان و بۆماوەیـەکی زۆر دەیهێڵنـەوەو دەیمـژن. گـەڵای ئـەم درەختـە بچووکە یـادەوەری مـرۆڤ بـەهێز دەکـات و، حـەزی خـواردن و خـەویش لاواز دەکات.(١) ئیتر لـەو کاتـەوە دیـارە مـژین و بـەکارهێنانی قـات لـەو ناوچـەیەدا بڵاوبووەو، تا ئیمڕۆش هەر باوەو خەڵك لەدانیشـتنی گشـتی بـەکاری دێـنن و قەدەغە نەکراوە.

بـــڕوا وایـــە لـــەڕێگای خۆرهەڵاتناســـەکانەوە، ئـــەورووپا لەســـەدەی حەڤدەیـــەم حەشیشــی ناســیبێت، هــەروەها بــڕوا وایــە نــاپلیۆنیش ئــەم جــۆرە مــادە هۆشـبەرەی لەمیسـرەوە بردبێتـەوە بـۆ فەرەنسـاو، لەوێشـەوە بـەنێو وڵاتـانی دەورووبەردا بڵاو بووبێتەوە.(٢)

---

١ ) المخـدرات، بحـث منشـور علـى الانترنـت فـي موقـع بوابـة البحـث، بـدون اسـم الباحـث https://www.researchgate.net.
٢ ) المخـدرات، بحـث منشـور علـى الانترنـت فـي موقـع بوابـة البحـث، بـدون اسـم الباحـث https://www.researchgate.net.

مادە هۆشبەرەکانی وەکو حەشیش و ئەڤیۆن و ڤینەب، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، یەکێك لەو مادانەی کە لەنێوان ولاتی چین و هیندا ئالۆگۆڕی بازرگانی پێدەکراو سالانە داهاتێکی زۆری بۆ هەردوو ولات و کۆمپانیاکانیان هەبوو، بەتایبەتیش هەناردەی هیندی بۆ بازاڕەکانی چین زۆر بوو، تا ئەو کاتەی کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاتی کە لەلایەن ئینگلیزە داگیرکەرەکانی هیندەوە دامەزرا بوو، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی بەسەر ئەم بازاڕەدا گرت.

لەدوای ئەم سالانەدا، چین کەوتە بەربەرەکانیٚ و ڕێگری لەهەناردەکردنی ئەو مادە هۆشبەرانە بۆ نێو بازاڕەکانی خۆی، بۆیە لەماوەی نێوان سالانی (١٨٣٩ ـ ١٨٤٢) جەنگێك لەنێوان بەریتانیاو چین هەلگیرسا کە ناسراوە بەجەنگی ئەڤیۆن. ئەم جەنگە بەدۆڕاندنی چینییەکان تەواو بوو، بۆیە ناچار بوون لەسالی (١٨٤٣) دا، ڕێکەوتننامەی (نانکین) مۆر بکەن، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە بەریتانیا دەستی بەسەر هۆنگ کۆنگدا گرتو چینیشی ناچارکرد بەندەرەکانی خۆی لەبەردەم کالانی بکاتەوە.

بەهۆی ئەم ڕێکەوتننامەیەوە، لەسالی (١٩٠٦) دا، زیاتر لە پازدە ملیۆنی چینی ئالوودەی بەکارهێنانی ئەڤیۆن و حەشیش ببوون، ئەم ڕێژەیە هەر زوو لەزیاد بووندا بوو. بۆیە، لەسالی (١٩٢٠) دا، بەزیاتر لەسەدا بیست و پێنجی نێری چینی ئالوودە ببوون. لەئەنجامدا، سالی (١٩٥٠) حکومەتەکەی ماوتسی تونگ بڕیاریدا پرۆگرامێکی کاراو گرنگ بخاتە کار بۆ لەناو بردنی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەرو شێوازی بەکارهێنان و بلاوبوونەوەی ڕێکخستەوەو سنوورداری کرد.

# بەشی چوارەم
# ڕێکەوتنە نێو دەوڵەتییەکان لەبارەی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر

**یەکەم: ڕێکەوتنی لاهای ساڵی** ( ١٩١٢ ).

ئەم ڕێکەوتنە بەیەکەم ڕێکەوتنی نێو دەوڵەتی دادەنرێت لەبارەی قەڵاچۆکردن و بەرەنگاربوونەوەی مادەی هۆشبەرو، چاودێریکردنی و، شێوازی بەکارهێنانی بۆ کاری پێویستی پزیشکی و نا پزیشکی، کە بەپێی یاسا ڕێگای پێدراوە. لەنێو ئەم ڕێکەوتنەدا، جەخت لەسەر دامەزراندنی دەستەیەکی چاودێری نێو دەوڵەتی کراوەتەوە بەسەر مادەی هۆشبەرو، دانانی سیستەمێکی داتاو زانیاری لەبارەی مادەی هۆشبەر لەنێوان وڵاتانداو، بەتاوان زانینی بەکارهێنان و بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر.([1])

**ڕێکەوتننامەی جنێڤی ساڵی** ( ١٩٢٥ ).

لەنێو ئەم ڕێکەوتننامەیەدا، جگە لەوەی جەخت لەسەر بنەماکانی ڕێکەوتنی لاهای کراوەتەوە، بەڵام زیاتر بایەخ بەچاودێریکردنی مادەی هۆشبەر دراوەو، بەناویش ئاماژە بۆ مادەی ئەڤیون و ئەو مادانەی تر کراوە کە لێیەوە هەڵدەهێنرجرێن و بەرهەم دێن.

---

[1]) الادمان على المخدرات وتأثيره على السلوك الاجرامي، اعمارن سهام وقرايشي سامية، بحث ماجستير، ٢٠١٨، ص٤١.

**ڕێکەوتننامەی ساڵی** ( ۱۹۳۱ ).

**ئەم ڕێکەوتننامەیە زیاتر بایەخ بەشێوازی دروستکردنی مادەی هۆشبەرو، شێوازی دابەشکردن و، بازرگانی پێوە کردنی دەدات. وڵاتانی بەشدار لەم ڕێکەوتننامەیە ناچار دەکات مادەی هۆشبەر، تەنیا بۆ کاری پزیشکی و ڕەوا بەکاربێنن.**

**ڕێکەوتننامەی ساڵی** ( ۱۹۳٦ ).

**ئەم ڕێکەوتننامەیە بەناوەکەیەوەی ناسراوە کە ناوی لێنراوە ڕێکەوتننامەی بەرەنگاربوونەوەو قەڵاچۆکردنی بازرگانیکردنی نا ڕەوا بەمادەی هۆشبەرو، داوا دەکات سزای توندی ئەو کەسانە بدرێت کە پێشێلی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەکەن.**[1]

**ڕێکەوتننامەی ساڵی** ( ۱۹٦۱ ).

**ئەم ڕێکەوتننامەیە لەهەموو ڕێکەوتننامەکانی پێشوووتر گشتگیرتر بوو، ئامانجی ئەوە بوو وڵاتانی بەشدار لەئیمزاکردن لەسەر ئەم ڕێکەوتننامەیە، بایەخ بەتەندروستی مرۆڤ بدەن و، وشیار بن بەرانبەر بەمەترسییەکانی مادەی هۆشبەر لەسەر تەندروستی مرۆڤ. ئەم ڕێکەوتننامەیە وڵاتانی بەشداری ناچارکرد لەسەر ئاستی نیشتیمانیدا یاسای تایبەت دابنێن و، بەرەنگاری باندەکانی بازرگانیکردن بەو مادانە ببنەوەو سزایان بدەن.**

---

[1] ) الادمان على المخدرات وتأثيره على السلوك الاجرامي، اعمارن سهام وقرايشي سامية، بحث ماجستير، ۲۰۱۸، ص٤١.

هەروەها داوا دەکات ئەم وڵاتانە لەنێوان خۆیاندا هاوکاری یەکتری بکەن لەلایەنی زانیاری و شارەزاییدا.([1])

رێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ قەڵاچۆکردنی بازرگانی نا ڕەوا بەمادەی هۆشبەرو کارتێکەرە عەقڵییەکان.

ئەو رێکەوتننامەیەیە کە نەتەوە یەکگرتووەکان لەدانیشتنی ڕۆژی (١٩٨٨/١٢/١٩) لەڤیینا ڕایگەیاندووەو (٣٤) مادە لەخۆ دەگرێت. ئەم رێکەوتننامەیە داوای هاوکاری نێو دەوڵەتی دەکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی بازرگانیکردن بەمادە هۆشبەرەکان و هەموو کارتێکەرە عەقڵییەکان و، داوا لەوڵاتانیش دەکات هەر یەکەو لەلای خۆیەوە بەپێی ئەم رێکەوتنە، ڕێکاری یاسایی و کارگێڕی بگرنەبەر، ئەوەش بەپێی یاساکانی ناوخۆی وڵاتەکانی خۆیان. هانیان دەدات چاودێری ئەو مادانە بکەن کە لەدروستکردنی مادەی هۆشبەرو کارتێکەرە عەقڵییەکاندا بەکاردێن و، داوا دەکات رێگری لەبازرگانیکردنی ئەو مادانە بکرێت لەڕێگا دەرياييەکانەوە.([2])

---

[1]) الادمان على المخدرات وتأثيره على السلوك الاجرامي، اعمارن سهام وقرايشي سامية، بحث ماجستير، ٢٠١٨، ص٤١.

[2]) الادمان على المخدرات وتأثيره على السلوك الاجرامي، اعمارن سهام وقرايشي سامية، بحث ماجستير، ٢٠١٨، ص٤٣.

# بەشی پێنجەم

## دیاردەی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکان لەهەرێمی کورستان

لەڕاستیدا هیچ داتاو زانیارییەکی دانپێدانراوی مێژوویی نییە لەبارەی مێژووی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرەکان لەهەرێمی کوردستاندا، بەڵام بێگومان وەکو هەر ناوچەیەکی تری عێراقیش و بەشێکیش لەعێراق، لەژێر کاریگەری بڵاوبوونەوەی ئەم مادانە بووە لەنێو عێراقدا. بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدان، پێش ساڵی (١٩٩٠)، تەنیا دوو کەیسی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر لەعێراقدا بەفەرمی هەبووەو دادگاییکراون، بەوەش بۆمان دەردەکەوێت کە عێراق و هەرێمی کوردستان پێش ساڵی (١٩٩٠) بەدەگمەن ئەم حاڵەتەی تێدا بووە، بەڵام لەدوای ئەو ساڵەو بەهۆی لاوازبوونی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق بەسەر ناوچە شیعە نشینەکانی باشوورو، ئازاد بوونی هەرێمی کوردستان، کۆنترۆڵکردنی سنوورەکان لاواز بوون.

ئەگەر پێش ساڵی (١٩٩٠) عێراق تەنیا ڕێڕەوێك و ڕێگایەك بوو بێت بۆ پەڕاندنەوەی مادەی هۆشبەر، لەو ساڵە بەدواوە هێدی هێدی سەرەتای چاندن و بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر لەهەرێمی کوردستان و باشووری عێراق سەری هەڵدا. هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩١ ــ ٢٠٠٣)، چەندینجار دەستیان بەسەر کێڵگەی چاندنی ئەو مادانە گرت و لەناویان بردن. ئەوەش مانای وابوو هەرێمی کوردستان لەڕێڕەوێکەوە

خەریکـە دەگۆڕێـت بـۆ بازرگـانیکردن و بەرهـەمهێنانی سـنووردار، بـەوەش هەرێم کەوتە بەر مەترسی بەکارهێنان و بڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر.

لـەدوای ڕووخـانی ڕژێمـی بـەعس، مـادەی هۆشـبەر بەشـێوەیەکی زۆر خێـرا لەسەرتاسەری عێراقدا بڵاوبۆوە. لەم قۆناغە تازەیەدا عێراق هەم ڕێڕەو بوو، هەمیش بەکاربەر، بۆیە سالْ بەسالْ ڕێـژەی بەکارهێنـەرانی مـادەی هۆشـبەر زیاتر بوو، ئەم حاڵەتـە هـەرێمی کوردستانیشی گرتـەوەو، لـەو کاتـە بـەدواوە بەهۆی کرانەوەی سنوورەکان بەڕووی بازرگانی نێـو دەوڵـەتی، بڵاوبوونـەوەی مادەی هۆشبەر پەرەی سەندو، لەحالەتەوە گۆڕا بۆ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و تەندروستی مەترسیدار.

لـەم چـەند سـاڵەی دواییـدا بڵاوبوونـەوەی مـادەی هۆشـبەر بۆتـە هـەواڵێکی گــەرمی دەزگاکــانی ڕاگەیانــدن، کــەم هەفتــە هەیــە هــەواڵێك لــەبارەی دەســگیرکردنی تــۆڕێکی بازرگــانیکردن و بڵاوکردنــەوەی مــادەی هۆشــبەر بڵاونەکرێتــەوە، هــەواڵی دەســگیرکردنی خــەڵك بەتۆمــەتی ئــالوودە بــوون بڵاونەکرێتــەوە. بۆیــە لەئێســتادا هــەرێمی کوردســتان لــەژێر هەڕەشــەی مەترسییەکی گـەورەو جدیدایـەو، پێویسـتی بەلێکۆڵینـەوەو بەدواداچـوون و یاسای تازەو چارەسەری فرە لایەن هەیە. ئەم هەوڵەی ئێمەش لێرەدا داومانە، بەشێکە لەوشیارکردنەوەو بەگژداچوونەوەی مادەی هۆشبەر.

لێرەدا کۆمەڵێك داتاو زانیاری لەبارەی هەندێك لەو بەندییانە بڵاودەکەینەوە کـە توانیومانــە لــەنێو بەندیخانــەو چاکســازییەکان پێیــان بگــەین و، داوای پڕکردنــەوەی فۆڕمـان لێکـردوون، تـاوەکو بتـوانین بەرچـاو ڕوونییـەکمان لەبارەی بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە هەبێت لەهەرێمی کوردستاندا.

## داتاو زانیاری لەبارەی چاکسازییەکانی شاری هەولێر

ئـەوەی خـوارەوە بریتییـە لـەوەڵامی ئـەو فۆڕمـەی بەتایبـەتی بـۆ ئیـدارەی چاکسـازی گـەورانی هـەولێر ئامـادە کـراوەو، لەلایـەن ئەوانـەوە بۆمـان پـڕ کراوەتـەوە. بێگومـان ئـەم فۆڕمـە ئەگەرچـی هەنـدێك ژمـارەی گـرنگ لـەخۆ دەگرێــت، بــەڵام زانیــاری زۆر وردی تێــدا نییــەو بەشــێوەیەکی تــەقریبی پڕکراوەتەوە، نەوەکو بەشێوەیەکی ورد.

## خوێندەوەیەك بۆ داتاو زانیارییەکانی چاکسازی ئافرەتان لەشاری هەولێر.

١) (٤) لەئالوودەبووان سەڵتن، بەڵام (٦) لەئالوودەبووان خێزاندارن.

٢) (٤) لـەئالوودەبووان بنەماڵەکـەیان سـەردانیان دەکـەن و پێوەنـدی کۆمەڵایـەتییان مـاوە، (٦) لـەئالوودەبووان پێوەنـدی کۆمەڵایـەتییان پچڕاوەو بنەماڵەکانیان سەردانیان ناکەن.

٣) (٩) لـەئالوودەبووان دانیشـتووی شـاری هـەولێرن، تـەنیا (١) کـەس دانیشتووی قەزایەکی دەرەوەی هەولێرە.

٤) هەر هەموو ئەو ئافرەتانەی فۆڕمیـان پـڕ کردۆتـەوە بێکارن و هـیچ ئیش و وەزیفەیەکیان نییە.

٥) لەناو ئەو فۆڕمانەی پڕ کراونەوتەوە، تەنیا (٢) کەس چەند ساڵێکە ئـالوودەبوون، (٨) کـەس لەوانـە تـازە چـەند مانگێکـە ئـالوودەبوون، بـەمانای ئـەوەی لـەو چـەند مانگـەی دواییـدا ئـالوودەبوون بـەمادەی هۆشبەر بەفراوانی بڵاوبۆتەوە.

٦) تەنیا (١) ئافرەت پێشتر بەندکراوە، ئەوانیتر (٩) کەس یەکەمجاریانە دەسگیر دەکرێن و بەهۆی ئالوودەبوونەوە گیراون.

٧) (٩) لەوانــە خراوەنەتــە بــەر بەرنامــەی ســەرلەنوێ ئامادەکردنــەوەو چاکبوونەوە، بەڵام (١) ئافرەت نەخراوەتە نێو ئەم بەرنامەیە.

٨) (٨) لــەم ئافرەتانــە لــەناو چاکســازی خراوەتــە بــەر بەرنامــەی ئامادەکردنەوەی دەروونی، بـەڵام (٢) ئـافرەت نـەخراونەتـە نێـو ئـەم بەرنامەیە.

٩) هەموو ئـەو ئافرەتانـەی فۆڕمیـان پـڕ کردۆتـەوە، پەشـیمانی خۆیـان پیشانداوە لەبەکارهێنانی مادەی هۆشبەر.

١٠) (٤) لەو ئافرەتانە پێیان وایە بارودۆخی دەروونییـان ئاسـاییە، بـەڵام (٦) ئافرەت پێیـان وایـە بـەهۆی بـەکارهێنانی مـادەی هۆشـبەر بـاری دەروونییان باش نەبووەو کێشەی زۆریان بۆ دروستبووە.

١١) مادەی هۆشبەری باو لەنێو ئەم ئافرەتانە بریتی بـووە لەکریسـتال و هیرۆیین و تلیاك، ئەو مادانەشیان لەلایـەن برادەرانیـان و لـەبازاڕەوە دەست کەوتووە.

# بەشی حەوتەم

## ئەنجامی توێژینەوەو ڕاسپاردەکان

### پوختەی لێکۆڵینەوە.

توێژینەوەو ڕاپۆرتە تازەکان لەسەر ئاستی جیهان، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کێشەی بڵاوبوونەوەی مادە هۆشبەرو ئالوودە بوون پێیان، هەمیشە لەزیاد بووندایە، بەشێوەیەك ساڵانە ناوچەو کولتوورو شارستانییەتی تازە دووچاری ئەم کێشەو گیرو گرفتە دێن. سەرەڕای ئەوەی هەر لەسەر ئاستی جیهانیدا، کۆمەڵێك ڕێکارو ڕێو شوێنی توند گیراوەتەبەرو، بەپێی یاسا لەنێو زۆربەی وڵاتانی جیهان، بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر قەدەغەکراوە، بەڵام پێدەچێت ئەم ڕێگارانە بەتەنیا بەس نەبن، بۆ ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی مادەی هۆشبەر، بەتایبەتیش ساڵانە لەسەر ئاستی جیهاندا، ملیارەها دۆلار قازانجی ئەم جۆرە بازرگانییە نا یاساییە.

بەپێی هەندێك توێژینەوە، لەساڵی (٢٠٠١) دا، بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر (٨٪) کۆی گشتی بازرگانی جیهانی پێکهێناوە. بەپێی ڕاپۆرتی پرۆگرامی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش، کۆی پارەی دەسکوتووی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەر لەسەر ئاستی جیهانی زیاتر لە (٥٠٠) ملیار دۆلاری ساڵانەیە، بۆیە لەداهاتی نەوتی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت زیاترەو،

بەپلـــەی دووەم دێـــت لەســـەر ئاســـتی داهـــاتی ســـاڵانەی جیهانیـــدا، دوای بازرگانیكردن بەچەك.([1])

پێدەچێت باندەكانی بازرگانیكردن لـەنێو زۆر لـەوڵاتان، دەسـەڵاتیان هـەبێت، یا بەشێوەیەكی نا ڕاستەوخۆ بەشێك لەدەسەڵاتی نێو ئەم وڵاتانـە لـەم جۆرە بازرگانییـە تێـوەگلابن، بۆیـە هەمیشـە ڕێگـاو شـێوازی تـازە دادەهێـنن بـۆ بـرەودان بەبازرگانییەكـەیان، بـێ ئـەوەی ویـژدانیان ئازاریـان بـدات، بـەهۆی ئـەوەی ملیۆنـەها مـرۆڤ دووچـاری مـاڵوێرانی و ئـالوودە بـوون و كارەسـات دەكەن.

بەشێكی گرنگی ئـەم بەرەنگاربوونەوەیـەی بازرگـانیكردن بـەمادەی هۆشـبەر، دەبێـت ئاڕاسـتەی كـۆی گشـتی كۆمەڵگـە بێـت و، كۆمەڵگـە لەمەترسـییەكانی بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە وشیار بكرێتەوە، ئەوەش بەشێكی بنچینەیی ئەم توێژینەوەیەی ئێمەیە. ئەگەر ئێمە لەهـەرێمی كوردسـتان، بـەهۆی كۆمـەڵێك فاكتـــەری نـــاوخۆیی و دەرەكـــی، نـــەتوانین بەشـــێوەیەكی كـــارا بـــەرەنگاری بازرگانـــانی مـــادەی هۆشـــبەر ببینـــەوە، بـــەڵام دەتـــوانین كـــار لەســـەر وشیاركردنەوەی كۆمەڵگە بكەین، بەتایبەتیش توێژی گەنجان، چونكە یەكێك لـەڕێگا كاراكـانی بەرەنگاربوونـەوە، بریتییـە لەهـەوڵی كەمكردنـەوە كڕیـارو بەكارهێنەر.

پرۆسەی كەمكردنەوەی كڕیارو بەكارهێنـەر، پێویسـتی بەوشـیاری و زانـین و خۆپاراستن هەیە. لەهـەمان كاتیشـدا، كێشـەیەكی فـرە ڕەهەنـدو فـرە ئاسـتە،

---

[1]) عوامل الخطر والوقاية من تعاطي الشباب للمخدرات، فريدة قماز، بحث لنيل شهادة الماجستير في جامعة منتوري قسنطينة الجزائرية، ٢٠٠٩، ص١٤.

لەبەرئـەوەی دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە، دەبێـت لەسـەر ئاسـتی کـۆی گشـتی کۆمەڵگەدا کاری لەسەر بکرێت و، تاکە لایـەنێك و دەزگایـەك و وەزارەتێـك و، تەنانەت حکومەتیش بەتەنیا ناتوانێت ئەم دیاردەیە لەناو ببـات، یـا کـەمتری بکاتەوە. بۆیە ئەگەر لەڕابردوودا هەرێمی کوردسـتان ڕێڕەوێـك بـوو بێـت بـۆ گواسـتنەوەو بازرگـانیکردن بـەمادەی هۆشـبەر، ئـەوە لەئێسـتادا وا خەریکـە دەبێتـە بـازاڕێکی گـەورە بـۆ بازرگانـان، لێـرەوە قۆنـاغی مەترسـیدار دەسـت پێدەکات، کاتێك بەشێك لەکۆمەڵگە، هەرچەندە کەمیش بێـت، بـەڵام ئـالوودە دەبێت.

کێشەی بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی ئالوودە بـوون بـەمادەی هۆشـبەر، دەبێـت لەسـەر چـەندین ئاسـتی جیـاواز ئیشـی لەسـەر بکرێـت. لەلایـەك، بەرهەمهێنـەرەکان هـەن، ئەوانـە مـادە سـەرەکییەکە بەرهـەم دێـنن. دواتـر، بازرگانان دێن و بڵاوی دەکەنەوەو دەیفرۆشن. ئینجا بەکاربەرو ئالوودە بووی مادەی هۆشبەر دێت و دەبێتە قوربانی دەستی ئەم دووانەی سەرەوە.

بۆیە بڵاوکردنەوەی مادەی هۆشبەر، پرۆسەیەکی هەڕەمەکی و سادەو ئاسـایی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی ڕێکخراوەو کۆمەڵێك باندی دەسـەڵاتدارو باڵادەسـتی لەپشتەوەیە، کەسانێکی لەپشتەوەیە پۆستی حکومی و حزبی خۆیان لـەپێناو ئـەم بازرگانییـە بـەکاردێنن، بۆیـە پـڕە لەکێشـەو مەترسـی و ئـاڵۆزی و، بەچەندین کـەناڵی جیـاوازدا تێدەپـەڕێت، تـاوەکو لەکۆتاییـدا دەگاتـە دەسـتی ئالوودە بووان بەمادەی هۆشبەرو قوربانیانی دەستی ئەم دیاردەیە.

لەبـەر گـەورەیی و کێشـە مەزنـەکانی بڵاوبوونـەوەی مـادەی هۆشـبەر، لەسـەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا، کۆمەڵێك دەزگاو دامەزراوەی تایبەت و نیمچـە تایبـەت

دامەزراون، بۆ ئەوەی پێکەوە لەگەڵ حکومەتی وڵاتان هەماهەنگی بکەن و ئەم دیاردەیە ڕیشەکێش، یا کەمتر بکەنەوە. بۆیە ئەم دامەزراوانە بەشێوەیەکی گشتی ئیش لەسەر لەناو بردن و بەرەنگاربوونەوەی مادە هۆشبەرەکان دەکەن لەسەر ئاستی جیهانیدا.

پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لەناوبردنی مادە هۆشبەرەکان (UNDCIP)، بەشی مادە هۆشبەرەکان لەپۆلیسی نێو دەوڵەتی (INTERPOL)، دەستەی نێو دەوڵەتی چاودێریکردنی مادە هۆشبەرەکان (INCB)، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO)، ڕێکخراوی کاری نێو دەوڵەتی (ILO)، سندوقی نێو دەوڵەتی پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لەناوبردنی مادە هۆشبەرەکان و پاراستن لێی (UNFDAC) کە یارمەتی ئەو وڵاتانە دەدات کێشەی چاندن و بازرگانیکردن و بەکارهێنانی مادەی هۆشبەریان هەیە.

بۆیە تاوەکو ئێمەش لەهەرێمی کوردستان بتوانین بەرەنگاری ئەم دیاردە تازەیەی نێو کۆمەڵگەی کوردستانی ببینەوە، لەلایەك پێویستە داوای هاوکاری و هەماهەنگی لەم دامەزراوە نێو دەوڵەتییانە بکەین، لەلایەکی تریش پێویستە یاسایەکی تایبەتمان هەبێت و لەلایەنی پەرلەمانی کوردستانەوە بەیاسایەك بڕیاری لەسەر بدرێت.

هەروەها پێویست دەکات دامەزراوەیەکی گەورە لەسەر ئاستی ئەنجوومەنی وەزیران پێکبهێندرێت، بۆ بەدواداچوونی ئەم دیاردەیەو دانانی پلانی نزیك مەوداو دوور مەوداو، بەدوا داچوون بکات بۆ شێوازی بڵاووبوونەوەی مادەی هۆشبەرو، ئەو کەس و لایەنانەی لەپشت بازرگانیکردنن پێیەوەو، ئالوودە

بووانیش وەکو قوربانی تەماشا بکرێن و بخرێنە ژێر بەرنامەیەکی پتەوی تەندروستی و پزیشکی، بۆ ئەوەی چارەسەری وەربگرن و بتوانن وەکو کەسێکی تەندروست و چالاك و بەرهەمهێن، بگەڕێنەوە نێو کۆمەڵگە.

# ئه نجام و ڕاسپاردەکان

## ئه نجامەکان

١) دەرکـەوتووە کـە لەهـەرێمی کوردسـتان مـادەی هۆشـبەری جـۆری حـەبی ترامادۆل بەپلەی یەکەم دێت لەبەکارهێنانـدا، ئینجا حەشیش بەپلـەی دووەم دێت، دواتر هیرۆیین و مادە جییاوازەکانی تر دێن.

٢) توێژینەوەکـە بـۆی دەرکـەوتووە ئێمـە لەهـەرێمی کوردسـتان خـاوەنی یاسایەکی تازەو شارستانی نین بۆ بەرەنگاربوونەوەی مادە هۆشـبەرەکان. ئەگەرچـی لـەعێراق سـاڵی (٢٠١٧) یاسـای ژمـارە (٥٠) ی تایبـەت بـە بەرەنگاربوونـەوەی مـادە هۆشـبەرەکان دەرچـووە، بـەڵام ئـەم یاسـایە لەهـەرێم ئینفـاز نـەکراوەو کـاری پێناکرێـت، جگـە لـەوەش کۆمـەڵێك تێبینـی لەبارەیـەوە هەیـە. بۆیـە، لەهـەرێمی کوردسـتاندا بـەپێی یاسـای سزای عێراقی ساڵی (١٩٦٩) ی هەموار کـراو کـار دەکرێـت، ئـەم یاسایەش کۆنەو لەگەڵ سەردەمی ئێستا ناگونجێت.

٣) بـەپێی ئـەم توێژینەوەیـە، بەشـێك لەبەکارهێنـەرانی مـادەی هۆشـبەر دووچـاری کێشـەی کۆمەڵایـەتی هـاتوون و لەلایـەن بنەماڵەکانیانـەوە سەردانیان ناکرێت و فەرامۆشکراون.

٤) لەئێستادا ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەر وەکو عەیبەیەکی کۆمەڵایـەتی تەماشـا دەکرێـت و هەوڵـدەدرێت لەلایـەن خێزانـەوە بشـاردرێتەوە. هـەروەها، حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانیش هـیچ داتایـەکی فـەرمی ڕاسـتەقینەو یـەکگرتووی بڵاونەکردۆتـەوە، چ لـەبارەی دەسـگیرکردنی

باندەکانی بازرگانیکردن بەمادەی هۆشبەرو سزاکانیان، چ لەلایەن ئەو کەسانەی ئالوودە بوون و بوونەتە قوربانی.

٥) بەشێکی زۆر لەوانەی بەهۆی ئالوودە بوونەوە گیراون و بەندکراون، تەنیا چەند مانگێکە ئالوودە بوون. کەواتە، ئالوودە بوون وەکو دیاردەیەکی مەترسیدار خەریکە لەم چەند ساڵەی دوایی بڵاودەبێتەوە.

٦) بەشی هەرە زۆرینەی ئالوودە بووان بەهۆی هاوڕێکانیانەوە ئالوودە بوون، لەڕێگای ئەوانەوە فێربوون و لەڕێگای ئەوانیشەوە مادەی هۆشبەریان دەست دەکەوێت.

٧) خەڵکانێك هەن بەهۆی تاوانێکی تر بەندکراون، لەبەندیخانە بەهۆی تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئالوودە بووان، فێری بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر بوون و، دواتریش ئالوودە بوون.

٨) بەشێکی زۆری بەندییەکان نەخراونەتە نێو پرۆگرامی تایبەت بەوشیارکردنەوەو ئامادەکرنەوەی دەروونی و تەندروستی، تاوەکو دوای ئەوەی ماوەی سزاکەیان تەواو دەکەن، بتوانن بگەڕێنەوە نێو کۆمەڵگەو بەیەکجاری واز لەمادەی هۆشبەر بێنن.

٩) بەشێکی زۆر لەئالوودە بووان بەهۆی ئالوودە بوونەوە دووچاری کێشەی دەروونی هاتوون و کێشەی زۆریان هەیە.

١٠) هەموویان پەشیمانن لەوەی ئالوودە بوون، حەز دەکەن بەزووترین کارت چارەسەر بکرێن و ئازاد بکرێن و، ئامادەن بۆ ئەوەی بچنە نێو قۆناغی چارەسەری.

١١) مادەی هۆشبەری باو لەنێو ئافرەتان بریتی بووە لەکریستال و هیرۆیین و تلیاك، ئەو مادانەشیان لەلایەن برادەرانیان و لەبازاڕەوە دەست کەوتووە. لەکاتێکدا مادەی باوی نێو پیاوان حەبی ترامادۆل بووە.

## ڕاسپاردەکان

١) دانانی یاسایەکی تازەو سەردەمییانە لەلایەن پەرلەمانی کوردستان بۆ ڕێگرتن و بەرەنگاربوونەوەی دیاردەی ئالوودە بوون بەمادەی هۆشبەرو، سەپاندنی سزای توونـد بەسەر ئەو کەسانەی بازرگانی پێوە دەکەن.

٢) دانانی سیستەمێکی کۆمپیوتەری سەرتاسەری لەهەرێمی کوردستان بۆ کۆکردنەوەی داتاو زانیاری لەبارەی کەسانی ئالوودە بوو و، ئەو مادانەی پێی ئالوودە بوون و، نوێکردنەوەی ئەم داتایانە بەشێوەی مانگانە، تاوەکو بزانین ئایا بەهۆی هەنگاوەکانمان بەرەوپێشەوە دەچین، یا پاشەکشە دەکەین.

٣) پێکهێنانی لیژنەیەکی وەزاری باڵا لەسەر ئاستی ئەنجوومەنی وەزیران و لەژێر سەرپەرشتی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران، کە لەوەزارەت پێوەندیدارەکان پێکهاتبێت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیەو دانانی بەرنامەیەکی زەمەنی و جێبەجێکردنی و چاودێریکردنی.

٤) بایەخدان بەئامادەکردنی پۆلیس و ئاسایش بۆ تێگەیشتن لەم دیاردەیەو کردنەوەی خوولی تایبەت بۆیان، تاوەکو تێگەیشتنێکی باشتریان هەبێت لەبارەی ئالوودە بووان و، شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیان بەپێی

بنـەماکانی مـافی مـرۆڤ. هـەروەها خـوولی تـازەو نوێیـان بـۆ بکرێتـەوە لەبارەی ناسینی مادە هۆشبەرەکان و کاریگەرییەکانی بەسەر مرۆڤ.

٥) هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی سیمینارو کۆڕو کۆنفرانسی زانستی تایبەت بـەم دیاردەیـــەو شـــێوازەکانی بەرەنگابوونـــەوەی. هانـــدانی نووســـینی لێکۆڵینـەوەی تایبـەت بـەئالوودە بـووان، بەتایبـەتیش لەسـەر ئاسـتی زانکۆکاندا.

٦) مامۆسـتایانی زانکـۆو دوا ناوەندییـەکان ڕاهێنانیـان پێبکرێـت و خـوولی تایبـەتیان بـۆ بکرێتـەوە، بـۆ ناسـینی ئـەو قوتابیانـەی ئـالوودە بـوون بـــەمادەی هۆشـــبەرو، بـــەهاوکاری لەگـــەڵ ئیـــدارەو خێـــزان، هـــەوڵی یارمەتیدان و چارەسەرکردنیان بدەن.

٧) دامەزرانـدنی نەخۆشـخانەی تایبـەت بەچارەسـەرکردنی ئـالوودە بـووان لەهەر چوار شارەکانی هەرێمی کوردستان و، دابینکردنـی کـەل و پـەل و دەرمان و پزیشکی پێویست بۆ ئەنجامدانی ئـەم ئەرکـە. لێـرەدا دەکرێـت سوود لەئەزموونی وڵاتان وەربگیرێت لەم بارەیەوەو بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت، دەکرێت پزیشك و پسپۆڕی تایبەتی بێگانە لەم نەخۆشـخانانە کـار بکەن، تاوەکو پزیشك و کـادری خۆمـاڵی لەسـەر دەسـتیان ڕادەهێنـرێن و فێـــر دەبـــن، چـــونکە ئـــەوە دیاردەیـــەکی تازەیـــە لـــەنێو کۆمەڵگـــەی کوردستانیدا.

٨) ئەنجامـدانی هەڵمـەتی وشـیارکردنەوەی گـەورە لەسـەر ئاسـتی پارێزگـاو قـەزاو ناحیـەکان، بـە بەشـداری دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن و، پزیشـکان و، چالاکوانانی مافەکانی مرۆڤ و، پیاوانی ئایینی و ... تاد.

٩) تـا ئێسـتاش لـەنێو هـەرێمی کوردسـتاندا خێـزان بنەمایـەکی بـەهێزی پێوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانـەو منـداڵان لەباوەشـی خێـزان پـەروەردەو گـەورە دەبـن، بۆیـە لەسـەر باوکـان پێویسـتە ڕەچـاوی بنـەماکانی پەروەردەی باش بکەن کە لەسەر بنەماکانی کاری باشەو دوور کەوتنەوە لـەکاری خراپـە دامـەزراوەو، هەوڵبـدەن بـزانن منـداڵانیان چ جـۆرە هاوڕێیەکیان هەیـەو لەگـەڵ کـێ هـەڵس و کـەوت دەکـەن و، سـەردانی چ شوێنێك دەکەن.

١٠) زینـدانی نـەکردن و دەسگیر نـەکردنی ئـەو کەسانەی بـۆ یەکەمجاریانـە مادەی هۆشبەر بەکاردێنن، یا ماوەیەکی کەمە فێری بەکارهێنانی بوون. لەبری ئەوە بەهاوکاری خێزانەکانیان بخرێنە نێو بەرنامـەی سـەرلەنوێ ئامادەکرنەوەو گێڕانەوە بۆ نێو کۆمەڵگەو، بخرێنـە نەخۆشـخانە تـاوەکو لەژێر چاودێری پزیشکی تایبـەت، جەسـتەیان لـەم جۆرە ژەهرانـە پـاك بکرێتەوەو، هاوکاری دەروونـی و کۆمەڵایـەتی بکـرێن. ئەوانـەی بێکارن، هەوڵبـدرێت کاریـان بـۆ بدۆزرێتـەوە، یـا فێـری پیشـەیەك بکـرێن و هانبدرێن بۆ کارکردن.

١١) سەپاندنی سزای توند بەسەر ئەو کەسانەی بازرگانی بەمادەی هۆشـبەر دەکـەن، بەشـێوەیەك هـیچ جـۆرە لێبـوردنێکی گشـتی و تایبـەتی نەیانگرێتەوە.

١٢) بابەتی مادەی هۆشبەر بخرێتـە نێـو خوێنـدن، بەتایبـەتی لـەقۆناغی دوا ناوەندیـدا، یـا دەکرێـت لـەقۆناغی یەکەمـدا مامۆسـتایان ڕابهێنـرێن بـۆ

ئەوەی وانەی تایبەت بەقوتابیان بڵێنەوە لەبارەی مەترسییەکانی مادەی هۆشبەر.

١٣) دەبێــت ئــالوودە بــوون بــەمادەی هۆشــبەر، چــیتر وەکــو عەیبەیــەکی ئابڕووبــەر تەماشــا نــەکرێت و، خێزانــەکان هانــد بــدرێن یارمــەتی ئەنــدامانی ئــالوودەی خۆیــان بــدەن و پاڵپشــتیان بکــەن بــۆ وەرگرتنــی چارەسەری پزیشکی.

١٤) دەبێــت جیاکــاری بکرێــت لــەنێوان بازرگــانیکردن بــەمادەی هۆشــبەرو، بەکارهێنــەرانی مــادەی هۆشــبەر، چــونکە ئەوانــەی بازرگــانی بــەمادەی هۆشبەر دەکەن، شایانی سزای توونـدن، بەڵام ئالوودە بووان دەبێت وەکو قوربانی مادەی هۆشبەر تەماشا بکرێن و یارمەتی بدرێن بۆ ئەوەی چاك ببنەوە.

# کۆتـایی